حکومەتی هەرێمی کوردستان - عێراق
وەزارەتی پەروەردە
بەڕێوەبەرایەتی گشتی پرۆگرام و چاپەمەنییەکان

# مێژووی شارستانییەکان

## پۆلی دەیەمی ئامادەیی وێـژەیـی

**دانەران**

د. قادر محمد پشدەری    د.محمد صالح طیب زێباری

د. زرار صدیق توفیق

**وەرگێڕانی**

لێژنەیەك لە وەزارەتی پەروەردە

**پێداچوونەوەی زانستی**

د.قادر محمد پشدەری    د. عبدالحکیم ئەحمەد مامبکر

چاپی دەیەم    ١٤٣٦ کۆچی    ٢٧١٥ کوردی    ٢٠١٥ زایینی

# پێشەکی

مامۆستای بەڕێز:

ئـەم کتێبـە بـۆ یەکەمیـن جـارە دەکەوێتـە بـەر دەسـتـتان... تێـیدا نیشـك خراوەتـە سـەر مانـا مرۆڤایەتیـیەکەی چەمکـی شارستانیـبوون..
بۆیـە لـە کوردسـتان کـە یەکەمیـن هێلانـەی شارستانیـبوون بـووە لـە ڕۆژهـەڵات، باسـەکان بـەرەو دۆڵـی ڕافیدەیـن و نیـل و ئێـران و یۆنـان... هتـد ئامـاژە بـە فرەلایەنـی چەمکـی شارسـتانییەت دەکـەن.
هیوادارین ئـەم بەرهەمـە تـا ڕادەیـەك کەلێنەیەکـی لـەم بـوارە پـڕ کردبێتـەوە.. ئێـوەی بەڕێـز.. بـە سـەرنج و ڕەخنـەکان دەتوانـن بـۆ چاپـی داهاتـوو.. بەرهەمەکـەی دەوڵەمەندتـر بکـەن.
لەگەڵ هیوای سەرکەوتن

دانـــەران

# بەشی یەکەم



## أ- شارستانییەت:

### ناساندنی شارستانییەت:

توێژەران لەسەر پێناسەیەك بۆ شارستانییەت ڕێکنین، هەندێك زاراوەی (کولتوور- cultur ) بەکاردێنن کە مانای (ڕۆشنبیری) دەبەخشێت، هەندێکی تر زاراوەی (civilization) بەکاردێنن، کە بەمانای (شاریبوون) دێت، لە زمانی کوردیدا زاراوەی (شارستانییەت) بۆ هەمان مانا بەکارهاتووە، کە مانای نیشتەجێبووانی شارو شێوازی ژیانیان دەگرێتەوە، بەڵام مانا فراوانەکەی دانیشتووانی شارو شارۆچکەکان دەگرێتەوە. ژمارەیەك لە توێژەران لە بەکارهێنانی زاراوەی (شارستانییەت) دا ئاماژە بە لایەنی رووحی و مەعنەوی ژیانی دانیشتوان دەکەن، هەندێکی دیکەیان لایەنە ماددیەکان دەکەنە مەبەست. دەتوانین (شارستانییەت) بەم شێوەیە پێناسە بکەین: بریتییە لە هەموو ئەو دەسکەوتانەی مرۆڤ کە لە بوارەکانی هزر و ڕۆشنبیری و هونەر و ئاواکاری بەدەستی هێناون، هەروەها لە بواری ئابووری وەکو کشتوکاڵ و بازرگانی و پیشەسازی و گەشەپێدانی ڕێگەکانی هاتوچۆو هۆکارەکانی پەیوەندیکردن.

لە خوێندنی (مێژووی شارستانییەت) دەبێت ڕەچاوی ئەم خاڵانە بکەین:

**یەکەم :**

شارستانییەتی مرۆڤایەتی کە ئێستا لە سایەی دەسکەوتەکانیدا دەژین، قۆناغ بە قۆناغ و لەسەرخۆ گەشەی کردووەو، ڕەگەکانی دەگەڕێتەوە بۆ هەزاران ساڵ لەمەوبەر.

**دووەم:**

هەموو گەلانی جیهان هەریەك بە ڕێژەی جیاجیا بەشداریان لە بنیاتنانی شارستانییەتدا کردووە.

**سێیەم:**

دەشێ گەلانی دنیا دیاردەکانی شارستانییەت لە یەکتر وەربگرن.

**چوارەم:**

دیاردە شارستانییەکان لە نێوان گەلانی جیهان بە خێرایی بڵاوبووەتەوە ڕەگیان بۆ ماوەیەکی درێژ داکوتاوە.

**پێنجەم:**

ژینگەی سروشتی ڕۆڵێکی سەرەکی لە نمایشکردنی شارستانییەت و گەشەسەندن و جۆری دیاردە شارستانییەکان و بڵاوبوونەوەیان هەبووە.

**شەشەم:**

زۆر لە ڕەگەکانی دیاردە شارستانییەکان بە تایبەتی داب و نەریتەکان و شێوازی ڕەفتار دەگەڕێنەوە چاخە کۆنەکان.

**حەوتەم:**

هەندێك لە دیاردە شارستانییەکان دەگۆڕێن یان لەناودەچن بەهۆی گۆڕانی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتییەوە.

**هەشتەم:**

پێویستە دوورکەوینەوە لە بەخشینی مۆرکی (خۆجێی نیشتمانی و نەتەوەیی و هەرێمی) بە دەسکەوتە شارستانیەکان، چونکە شارستانییەت بە گشتگیری و بڵاوی لە ناو گەلانی جیهانیدا دەناسرێتەوە، بۆیە باشتر وایە مۆرکی مرۆڤایەتیان پێببەخشن و بێ گوێدانە کات و شوێن ناوی (شارستانییەتی مرۆڤایەتی) لێبنێین، چونکە بەرهەمی ئەزموونی گەلانە و زیاتر لەسەر بنەمای ئایینی دەناسرێ، بەڵام ئەمە بەمانای لەبەرچاو نەگرتنی تایبەتمەندییەکانی هەر شارستانییەتێك نییە کە جیای دەکاتەوە لەوانی دیکە.

# ب: شارستانییەتی کوردستان

## ١- شـۆڕشی کـشـتوکاڵی

مـرۆڤ لـە چاخـە کۆنەکانـەوە، واتـە (پێـش زیاتـر لـە ٦٠ هـەزار سـاڵ) لـە چیاکانـی کوردسـتان ژیـاوە، ئەشـکەوتەکانی کـردووە بـە جێگـەی حەوانـەوە، بەڕاوکـردن و کۆکردنـەوەی بـەری دارەکان و ڕەگـی ڕووەك ژیانـی ڕۆژانـەی بەسـەربردووە. بـۆ ماوەیەکـی زۆر ژیانێکـی سـادە و کۆچەرایەتـی دوور لـە شارسـتانییەتی بەسـەربردووە، پـاش پەیبـردن بـە کشـتوکاڵکردن لـە دەوروبـەری هـەزارەی نۆیەمـی پێـش زاییـن، ژیانـی مـرۆڤ گـۆڕاوە، لـە شـوێنێکدا جێگیـر بـووە، خانـووی بۆخـۆی لـە نزیـك کێڵگـەی بنیاتنـاوە، بـە کۆبوونـەوەی چەنـد خانوویـەك لـە دۆرمانـدۆری یەکـدا، گونـد پێکهـات، لێـرەوە سـەرەتای شارسـتانییەت دامـەزرا.

یەکەمیـن گونـدی کشـتوکاڵی لـە پێدەشـتەکانی کوردسـتان و یەکەمیـن مۆڵگـەی شارسـتانییەتی جیهـان، (گونـدی چەرمـۆ) یـە لـە نزیـك شـارۆچکەی (چەمچەمـاڵ) ی ئێسـتا (لـە پارێـزگای کەرکـووك). هاوچـەرخ لەگـەڵ گونـدی (چەرمـۆ)، جوتیارانـی گونـدی (نمریـك) لـە باشـووری شـارۆچکەی (فایـدە) ی ئێسـتا لـە پارێـزگای (دهـۆك)، دانیشـتوانی یەکەمیـن گونـدە کشـتوکاڵییەکان، گەنـم و جـۆ و نیسـکیان چانـدووە. ئاسـەواری گەنـم لە (چەمـۆ) دۆزراوەتەوە. خانووەکانیـان لەقـوڕو بـەرد بنیاتنـاوە، بایەخیـان بەبەخێوکردنـی (مەڕومـاڵات) و (بـزن) و (مانـگا) (چێـڵ) داوە، کەرەسـتەو ئامێـری ناومـاڵ و کشـتوکاڵیان دروسـت کـردووە، دواتـر گەشـەیان پێـداوە، جگـە لـە بـەرد ئێسـك و قـوڕو قیریـان لـە دروسـتکردنی کەلوپەلەکانیـان بەکارهێنـاوە.

پاشـان پیشەسـازی قـاپ و قاچـاغ و داس و تەشـی لـە قـوڕی سـوورکراو دەسـتی پێکـرد. بـەم شێوەیە مـرۆڤ چووتـە قۆناغـی پیشەسـازی (گـۆزەکاری).

ئافرەتـان سـەرقاڵی کاری ناومـاڵ و پـەروەردە کردنـی منداڵان بـوون، پیـاوان خۆراکیـان پەیـدا دەکـرد، و لـە کێڵگـە لەگـەڵ هاوکارانیـدا کاریـان دەکـرد و کێڵگـە و گوندەکەیـان دەپاراسـت، ئیتـر حـەزی موڵکـداری خاوەنێتـی زەوی پەیدابـوو.
هـەر بەهـۆی پێویسـتی بەردەوامـی کشـتوکاڵ بە کەرەسـەو ئامێر بۆ گەشـەپێدانی کەلوپەلـی ناومـاڵ هەندێـك لـە دانیشـتوانان پسـپۆریان لـە دروسـتکردنی چەنـد جۆرێـك لەوکەرەسـەو ئامێرانـە پەیداکرد.
بـەم شـێوەیە جۆرێکـی دیاریکـراو لـە (پسـپۆرایەتی) پەیدابـوو. ئـەم پسـپۆریە دەبێتـە مایـەی سـەرهەڵدانی چالاکـی (ئاڵوگۆڕکـردن)، بەرهەمهێنـی کەرەسـەی کشـتوکاڵی و کەلوپەلـی ناومـاڵ، بەرهەمەکانـی بـە بەرووبومـی کشـتوکاڵی ئاڵوگۆرکـردن . جـۆ یـان خـوری ، بوونـە هۆکارێکـی ئاڵوگـۆڕی بازرگانـی، چونکـە مـرۆڤ تـا سـەدەی شەشـەمی پ.ز دراوی نەزانیـوە.
ئەگـەر دروسـتکردنی ( کەرەسـەی کشـتوکاڵی و کەلوپەلـی ناومـاڵ) بـە جۆرێکـی پیشەسـازی بژمێریـن، دەتوانیـن فێربوونـی سـەرەتاکانی کشـتوکاڵ بـە « شۆڕشـێکی ئابـووری» لەقەڵـەم بدەیـن.



نموونەی دراوی کۆن

پەیدابوونـی کشـتوکاڵ بـووە مایـەی پەیدابوونـی پیشەسـازی و بازرگانـی و چالاکییەکانـی ئاڵوگـۆڕ و گواسـتنەوەی شـمەك و بەرووبومـەکان لـە ناوچەیەکـەوە بـۆ ناوچەیەکـی تـر، ئەمـەش وایکـرد گرنگـی بـە هۆیـەکان و ڕێگاکانـی گواسـتنەوە بدرێـت. لـە ئاکامـدا بیرکردنـەوەی جـدی لەمـەڕ دۆزینـەوەی هۆکارێکـی ئاڵوێـر هاتـە ئاراوە، (زیـو) بـووە ئـەو هـۆکارە بـۆ ماوەیەکـی بـۆ ماوەیەکـی درێـژ پاشـان مـرۆڤ (دراو) ی بەکارهێنـا، پاشـای شانشـینی (لیدیـا) لـە (ئاسـیای بچـووك) کـە نـاوی کراسـوس (قـارون) بـوو لـە مـاوەی نێـوان (٥٦٠-٥٤٦ پ.ز) فەرمانـڕەوا بـووە توانـی پـارە لـە زیـوو زێـڕ لێبـدات، لـە دەڤەرەکانـی تـر بڵاوبـووەوە. پێویسـتی مـرۆڤ بـۆ پاراسـتنی گوندوکێڵگـە کشـتوکاڵییەکان، بووەتـە مایـەی پەیدابوونـی (پیشەسـازی چـەك) و بونیاتنانـی شـوورەو قـەڵاو هەڵکەندنـی خەنـدەك وەکـو هـۆکاری بەرگـری. هەروەهـا پیـاوان لـەم رووەوە هـاوکاری یەکتریـان دەکـرد و (هێـزی هـاوکار و چەکـدار) پێکهـات، کـە لـەم سـەردەمە پێـی دەوتـرێ (سـوپا).

لەوانەیـە هەریەکێـك لـە ئێمـە بپرسـێت بۆچـی کوردسـتان پێـش هەرناوچەیەکی تـری جیهـان کـەوت لـە دۆزینـەوەی کشـتوکاڵدا، راسـتیەکەی ئەوەیـە کـە ژینگـەی کوردسـتان لـە رووی خـاك و ئـاوی بارانـەوە بـۆ کشـتوکاڵ گونجـاوە، ئەمـەش یارمەتیـدەر بـووە بـۆ سـەوزبوونی دانەوێڵـەی کێـوی لـە دۆڵـە بـە پیتەکانـی کوردسـتاندا، ئـەو کاتـەش مـرۆڤ دانەوێڵـەی کـۆ دەکـردەوە پێدەچێـت هەنـدێ لـەو دانەوێڵانـەی لـە نزیـك شـوێنی نیشـتەجێبوونیەوە لـە دەسـت کەوتبێتـە خـوارەوە پاشـان سـەوز بوو بێتـەوە، ئەمـەش سـەرنجی راکێشـاوە بۆیـە لـە سـەوزبوونە وردبۆتـەوە تـا دواتـر بـۆ خۆیشـی چاندوێتـی. هەندێـك لـە توێـژەران وای بـۆ دەچـن کـە ئافـرەت یەکـەم کەسـێ بووبـێ دەرکـی بـەو سـەوز بوونـە کردبـێ، چونکـە ئـەو هەڵدەسـتا بـە کوتـان و پاککردنـەوەو هاڕینـی دانەوێڵـە تـا خواردنـی لـێ دروسـت بکات. فێربـوون و دۆزینـەوەی شـێوازەکانی کشـتوکاڵ گۆڕانـی بنـەڕەت بـوو، چونکـە ڕەوتـی ژیانـی مرۆڤایەتـی، گـۆڕی. یارمەتـی مرۆڤـدا جێنیشـین بێـت و گونـد بنیـات بنێـت.. بـە تێپەربوونـی زەمەن (شـارۆچکەی و شـارەکان) پەیدابـوون، پەیوەندییە

کۆمەڵایەتییەکان دروست بوون، هۆکارەکانی شارستانی بوون هاتنە ئاراوە. بە واتایەکی تر کشتوکاڵ بوو بە یەکەم بەردی بناغەی بنیاتنانی شارستانییەت، چونکە رێرەوەی ژیانی مرۆڤایەتی گۆڕی، بۆیە دەتوانین بڵێین دۆزینەوەی کشتوکاڵ (کودەتا) یەك بوو لە ژیانی مرۆڤایەتی. هەروەکو چۆن زاراوەی کودەتا لە سەدەی هەژدەمی زایینی بە شۆڕشی پیشەسازی ئەوروپا گوترا.

## بڵاوبوونەوەی گوندە کشتوکاڵییەکان:

گوندە کشتوکاڵیەکان، لە باشووری کوردستان هاتنە فرەبوون، وەکو گوندی (حەسونە) لە باشووری شاری (موصل)، هاوچەرخی هەردوو گوندی (شەمشارە) لە دەشتی (رانیە) و گوندی (چوخەمامی) نزیکی (مەندەڵی) بوو، شوێنەواری چەندین گوندی کشتوکاڵی دۆزراوەتەوە کە مێژووەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمەکانی دوای (هەزارەی شەشەمی پ.ز) لەوانەش (گردی حەلەف) لە رۆژئاوای کوردستان لەسەر زێی خاپوور لە سوریا، و گوندی (ئارپەچی) لە نزیکی (نەینەوا) و گردی (تەپەسەراب) لە نزیکی کرماشان. گوندە کشتوکاڵییەکان لە ناوەند و باشووری عێراقیشدا زۆر بوون و تەشەنەیان سەند و کو گردی (الصوان) لە نزیکی (سامەرا). لە نیوەی دووەمی چاخی (بەردینی کانزایی ٥٦٠٠ - ٣٥٠٠ پ.ز) گوندی کشتوکاڵی لە باشووری عێراقدا پەیدابوون و شوێنەوارەکانی وەکو (تل العبید وتل الحاج محمد) دۆزراونەتەوە.

هاوشان لەگەڵ پەیدابوونی گوندی کشتوکاڵی، پێشکەوتنی شارستانی بەرچاو دەبینرێت، وەکو هەڵکەندنی (جۆگەکانی ئاودێری)، لە گوندی (چوخەمامی) تۆرێك لەم شێوەیە دیتراوە.

لە شوێنەوارە دێرینەکانی ئەم سەردەمە ژمارەیەك پەیکەری قوڕ دۆزرایەوە کە ئاماژەن بۆ پەیدابوونی سەرەتاکانی پەرستن لای مرۆڤ، کە شێوەی خوداوەندی دایك بەرجەستە دەکەن، وەك لە گوندی (چەرمۆ) و (تەپەسەراب) و (ئارپەچی).

هـەر لـەو شـوێنەوارە ئامـاژە پێکراوانـە، هەندێـك لـەو ئامرازانـە دۆزراونەتـەوە کـە ئافرەتـان بـۆ جوانـکاری بەکاریـان هێنـاوە لـە بـەرد و ئێسـك دروسـتکراون. لـە کۆتایـی (هـەزارەی شەشـەمی پ.ز) دا بەکارهێنانـی (کانـزا) بـاوی هەبـوو، لـە گـردی (حلـف) و (تەپەگـورا) ئامـرازی لـە کانـزا دروسـتکراو دۆزراوەتەوە. هەروەهـا مـرۆڤ (چەرخـی گڵـکاری) کانـزای لـە دروسـتکردنی قـاپ و قاچاغـی سـوورکراودا بەکارهێنـا. لـە کۆتایـی چاخـی بەردینـی کانزایـدا، مـۆری لوولەیـی بەکارهـات. و پەرسـتگا لـە باشـووری عێـراق و (تەپەگـورا) بنیاتنـرا. لـە دەوروبـەری (٣٢٠٠ پ.ز) مـرۆڤ نووسـینی وێنەیـی دۆزیـەوە و لـە دەوروبـەری (٢٨٥٠) دا لـە تۆمارکردنـی رووداوەکانـدا سـودی لێبینـی و بەمـە مێـژووی مرۆڤایەتـی چـووە قۆناغـی سـەردەمە مێژووییەکانـەوە.

## ٢- دانیشتوانی (کوردستان):

تۆمـارە (سـۆمەری) و (ئەکـەدی) یـەکان لـە (هـەزارەی سـێیەمی پ.ز) دا ئاماژەیـان بـە دانیشـتوانی کۆنـی کوردسـتان کـردووە، کوردسـتان لـەو سـەردەمە نـاوی (وڵاتـی سـوپارتو) ی لێنـراوە، بـە دانیشتوانەکەشـیان وتـووە (سـوپاریتەکان) و(سـۆپارییەکان) پـێ وتـراوە وەك (لولوبیـەکان) و (گوتیـەکان) بـۆ دانیشـتوانی کوردسـتان بەکارهاتـووە..

لـە (هـەزارەی یەکەمـی پ.ز) دا تۆمارەکانـی ئاشـورییەکان و بابلیـەکان ئامـاژە بـە نـاوی (ئۆراتـو و میدییـەکان و مانیـەکان و زگرتـو) دەکـەن.

وڵاتـی (کوردسـتان) دووچـاری پەلامـاری نەتەوەکانـی دراوسـێی بـووە، وەکـو پەلامـاری سـۆمەرییەکان و بابلییـەکان و ئاشـوورییەکان، پاشـتریش پەلامـاری فارسـەکان و گریکـەکان، بۆیـە مێژوونووسـی گریکـی (زینفـون) لـە دەوروبـەری سـاڵی (٤٠١ پ.ز) نـاوی (کـوردا) ی لـە کتێبەکـەی (Anabasisi) بـەرەو باکـوور هێنـاوە.. بـۆ مەبەسـتی شـارەزاکردنی خوێندکارانمـان بـە کورتـی ئامـاژە بـە هەندێـك لـە نەتـەوە دێرینەکانـی کوردسـتان و رۆڵـی شارسـتانیان دەکەیـن:

## یەکەم :( لولوبییەکان)

لـە تۆمـارە سـۆمەریەکاندا ناویـان بـە شـێوەی (لولوبـی) و (لولومـی) و (لولـو) هاتـووە. دەڤـەری شـارەزووی زێـدی ڕەسـەنیانە. بـەرەو باشـوور دەسـتیان بـە فراوانخـوازی کـرد ناوچەکانـی دەوروبـەری ڕووبـاری سـیروان (دیالـە)، پانایی ڕۆژئـاوای چیاکانـی زاگرۆسـیان گـرت و گەیشـتە باشـووری کوردسـتان لەگـەڵ گوتییـەکان لـە ناوچەکانـی ڕۆژهەڵاتـی زێـی بچـووك تێکـەڵ بـوون. لولوبیـەکان دووچـاری پەلامـاری دەوڵەتـی ئەکـەدی بـوون، پاشـای ئەکـەدی (نـەرام سـین ٢٢٩١ - ٢٢٥٥ پ.ز) لـە ناوچـەی شـارەزوور پەلاماریـان دەدات و داتاشـراوێك لـە گوزەرگەیەکـی شـاخاوی بـە نـاوی (دەربەنـدی گاور) لـە نزیـك قـەرەداغ بەجـێ دێڵێـت، بـەو هۆیـەوە دەربەندەکـە ئـەو نـاوەی لێنـرا، لـەم داتاشـراوەدا وێنـەی سـەرکەوتنی پاشـای ئەکـەدی بەسـەر لولوبیـەکان بەرجەسـتەکراوە. وادیـارە شـەڕ لـە نێوانیانـدا بـەردەوام بـووەو، هەندێـك بەڵگـەی مێژوویـی ئامـاژە بـە سـەرکەوتنی شـا (ئانۆبانینـی) پاشـای لولوبیـەکان دەکات، چـۆن شکسـتی دووچـاری هێزەکـەی (نـەرام سـین) دەکات، ئەویـش لـە داتاشـراوێکدا لـە ناوچـەی (سـەرپێل زەهـاب) بـە جێـی هێشـتووە تیایـدا شـا (ئانۆبانینـی) بـە تاجـی پاشـایەوە دەرکەوتـووە و بەرامبـەر خواوەنـد (عەشـتار) راوەسـتاوە، ئـەم سـەرکەوتنە لـە وێنـەی سـوپاس گـوزاری بـۆ خواونـدی (عەشـتار) دەنوێنـێ، چونکـە بـە پێـی بیروباوەڕی ئـەو کاتـە پاڵپشـتی بـووە لـەم سـەرکەوتنەدا.



میلی سەرکەوتنی نرام سین

## دووەم : گۆتیەکان:

گۆتیـەکان لـە هەرێمـی کوردسـتانی عێراقـدا جێنشـین بـوون، ڕۆڵـی ئەمانـە لـە کۆتایـی (هـەزارەی سـێیەمی پ.ز) دەردەکەوێـت. پـاش بڵاوبونەوەیـان لـە دەڤـەرە دەشـتەکانی نێـوان زێـی بچـووك و ڕووبـاری سـیروان، شـاری (ئەرابخـا) کەرکووکـی ئێسـتا گرنگتریـن مەڵبەندیـان بـووە. پاشـتریش هەمـوو ڕووبـەری عێـراق کۆنتـڕۆڵ دەکـەن بەهـۆی لاوازی دەوڵەتـی ئەکـەدی توانیـان بـۆ مـاوەی ١٢٥ سـاڵ حوکمرانـی عێـراق بکـەن.

ژمارەی پاشا گوتییەکان کـە لـەو ماوەیـەدا حوکمڕانـی هـەر پاشـایەك ٦سـاڵ بـوو، وادیـارە مـاوەی حوکمرانـی پاشـاکان دەسـت نیشـانکراو بـووە و پاشـا بـە هەڵبـژاردن دانـراوە.

گۆتیـەکان ڕێگەیـان داوە بـە سـۆمەریەکان شـێواز و ڕێـو شـوێنی کارگێـڕی و بەڕێوەبردنـی خۆیـان بپارێـزن بەرامبـەر بـە داننـان بـە سـەرووەری گۆتیـەکان. تۆمـارە سـۆمەریەکان ئامـاژە بـە بوونـی ژمارەیـەك بنەماڵـەی سـۆمەری دەکـەن کـە لـە مـاوەی حوکمڕانـی گۆتیـەکان لە باشـووری عێـراق حکومیان کـردووە، لەوانـە بنەماڵـەی (لەگـش) ی دووەم کـە بەهۆی پاشـاکەیان (گودیـا) و چالاکیە ئابووریەکانیانـەوە لـە بـواری بازرگانـی و ئـاواکاری ناوبانگیـان دەرکـردووە.

حوکمرانـی گۆتیـەکان بـەرەو لاوازی دەچێـت، لـە ژێـر فشـاری سـەربازی سـۆمەرییەکان بـەرەو باکـوور دەکشـێنەوە، لـە (ئەرابخـا) کەرکووکـی ئێسـتادا دووبـارە جێگیـر دەبـن.

## سێیەم: خورییەکان:

ڕۆڵـی (خورییـەکان) (خورییـەکان هـەروەك لـە تـەوراتـ ناویـان هاتـووە) لـە کوردسـتان بـە تایبەتـی و لـە ڕۆژهەڵاتـی ناوەڕاسـت بـە گشـتی لـە (هـەزارەی دووەمـی پ.ز) دەرەوت بـە تایبەتـی لـە ڕۆژئـاوای کوردسـتان ئەرابخـا و نـوزی (کەرکووکـی ئێسـتا) بوونەتـە مۆڵگـە سـەرەکیەکانیان، چەندیـن میرنشـینیان لـە (نەینـەوا) و (ئورفـە) و (رأس العیـن) دامەزرانـدووە.

خورییەکان ڕۆڵی بەرچاویان هەبووە لە گواستنەوەی دیاردە شارستانیەکان لە نێوان دەڤەرەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، ئەویش بەهۆی چالاکی بازرگانیەوە، چونکە کەمتر ئارەزووی شەڕیان بووە.

شاری (نوزی) لە (باشووری ڕۆژئاوای کەرکووك) بنکەیەکی سەرەکی خورییەکان بوو، شوێنەواری کۆشکێکی پاشایەتی و خانوو ڕێگەوبان و دیاردەی تری تێدا دۆزراوەتەوە.. لەم شوێنەوارە نەخشەیەکی کێشراو لەسەر تاتە قوڕێك دۆزرایەوە چیاو ڕووبار و شار و شوورەکان ڕێگە سەرەکیەکانی لەسەر دیارە، هەروەها سەدان تاتە قوڕی تر دۆزرانەوە، بەختی بزماری و بە زمانی ئەکەدی نووسرا بوون.



خواوەندێکی شاری نوزی

کاریگەری زمانی خوری بە تەواوی لەم نووسراوانەدا دەردەکەوێت.

ئەم نووسراوانەدا بەڵگەن لەسەر گرنگی کشتوکاڵ بۆ دانیشتوانی نوزی، چونکە باسی خاوەنداری زەوی دەکات، بەهۆی لێکۆڵینەوە لەو تاتە قوڕانەدا دەرکەوتوە کە ژمارەیەك لە خەڵکانی دەسەڵاتدار هەبوون خاوەنی ڕووبەری فراوانی زەوی بوون، وای بۆ دەچن لە (نوزی) سیستەمێکی بەرهەم هانین هەبوو بێت، ناوی سیستەمی (دەرەبەگایەتی - feudal system) ی لێناوە. ئەم سیستەمە لە سیستەمی بەرهەمهێنانی کۆیلایەتی کە لە ناوەند و باشووری عێراق باوبووە پێشکەوتووترە.

(نوزی) و (ئەرابخا) لە زۆربەی چاخەکانی مێژوودا سەربەخۆییەکی ناوخۆییان هەبووە، ڕاستەوخۆ نەکەوتنە ژێر دەسەڵاتی ئاشوریەکان، بەڵکو بەرامبەر بەمە سەرانەیان داوە.

سیستەمی حوکمڕانی لە (نوزی) وەکو سیستەمی حوکمرانی شارەکانی تری عێراق بوو، پاشا دەسەڵاتی زۆربوو، ئەو جێگری خواوەند بووە، لە بەڕێوەبردنی کارەکانی ژمارەیەك لە خزمەکانی یارمەتی داوەو دەستیان گرتبوو بەسەر کاروباری ئابووری و دارایی و کارگێڕیدا.
پاشانی (نوزی) بایەخیان بە چەسپاندنی (دادوەری) داوە، یەکێك لە دەقە دێرینەکان ئاماژە بە ئامادەبوونی پاشا دەکات لە یەکێك لە دادگاکان.



کارێکی هونەری لە نوزی

## چوارەم: میتانییەکان (١٥٠٠ - ١٢٧٥ پ.ز)

هەزارەی دووەمی پ.ز کۆچی نەتەوە هیندو ئەوروپیەکانی بەرەو دەڤەری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست تۆمار کرد، ئەم نەتەوانە لە کوردستان و ئێران و ئاسیای بچووك بڵاوبوونەتەوە، لەگەڵ دانیشتوانیان تێکەڵ بوون، لەگەڵ خۆیان چەندین دیاردەی شارستانیان هێناوە، کە بۆ چەسپاندنی دەسەڵاتیان لەو دەڤەرانە یارمەتیان داون.

لە گرنگترین ئەو دیاردانە وەکو بەکارهێنانی ئەسپ و گالیسکە بە ڕەوڕەوەی بازنەیی و شمشێری کەوانەیی. چەندین قەوارەی سیاسی پەیدابوو، لە هەموویان دیارتر دەوڵەتی میتای بووە.

ئەو دەوڵەتە لە ڕۆژئاوای کوردستان دامەزرا پایەتەختەکەی (واشوکانی) (مەزندە دەکرێت کە دەکەوێتە نزیکی شاری (رأس العین) (سەروکانی) ئێستای ڕۆژئاوای کوردستانی سوریاوە. ئەم دەوڵەتە توانی هەموو سوریا بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە.

هەروەها ئاشوورییەکانیش بۆ ماوەی زیاتر لە سەدەیەك کەوتنە بن دەستیانەوە، لە ڕۆژهەڵاتیش دەسەڵاتیان گەیشتە زۆربەی ناوچەکانی کوردستان، لەوانەش (نوزی و ئەرابخا).

### - پەیوەندییە نێو دەوڵەتییەکان:

میتانیەکان ڕۆڵیان هەبووە لە گۆڕینی پەیوەندییە نێو دەوڵەتییەکان لە نێوان هێزە سیاسییەکانی ڕۆژهەڵاتدا ئەمەش بووە هۆی چەسپاندنی سەقامگیری و تەبایی لە جێگەی جەنگ و دوژمنکاری، لاپەڕەیەکی نوێ لە پەیوەندییە دبلۆماسییەکان لە نێوان وڵاتانی ڕۆژهەڵاتدا ئاراوە.

پاشاکانی (میتانی) پەیوەندی باشیان بە پاشاکانی میسرەوە هەبووە، نامەو دیاری لە نێوان پاشاکانی (میتانی) و فیرعەونەکانی میسر ئاڵوگۆڕ کراوە، ئەو نامانە بە زمانی ئەکەدی و بزماری نووسراون، یەکێکیان بە زمانی خوری بووە.

فرعەونی میسر ئەمنحوتبی سێیەم (١٤٠٥ - ١٣٦٧ پ.ز) خاتوو تیدوخیبا

یاخـود تاشـواته (میسـریه‌كان پێیـان وتـووه - نه‌فرتیتـی - بـه واتـای ئافره‌تـی جـوان دێـت میتانـی هێنـاوه، پـاش مردنـی (ئه‌منحوتبـی سـێیه‌م) مێـردی بـه فیرعــه‌ون ئه‌منحوتبــی چــواره‌م (ئه‌خناتــون ١٣٦٧ - ١٣٥٠ پ.ز) كــردووه.
ئـه‌وه‌ی ئـه‌و نامانـه‌ی كـه لـه گـردی (ئه‌لعه‌مارنـه) پایه‌ته‌ختـی (ئه‌خناتـون) فیرعه‌ونـی میسـر دۆزرایـه‌وه ده‌خوێنێتـه‌وه، ده‌رك بـه پێشـكه‌وتنی په‌یوه‌ندییـه سیاسـییه نێوده‌وڵه‌تییه‌كانـی ئـه‌و سـه‌رده‌مه ده‌كات كـه به‌هـۆی میتانیه‌كانـه‌وه هاتۆتـه ئاراوه، ئه‌مـه‌ش لـه‌و نامـه‌و دیاریانـه‌دا ده‌رده‌كه‌وێت كـه لـه نێوانیانـدا ئاڵوگۆڕكـراوه، هه‌روه‌هـا مه‌سـه‌له‌ی ژن و ژنخوازیـش لـه نێـوان پاشـاكانی ئـه‌و سـه‌رده‌مه جۆرێكـی تـری پته‌وكردنـی په‌یوه‌ندییه نێـو ده‌وڵه‌تییـه‌كان بـوو.
پـاش دوو سـه‌ده لـه حوكمرانـی، ده‌وڵه‌تـی میتانییـه‌كان بـه‌ره‌و لاوازی ده‌ڕوات، به‌هـۆی په‌لاماردانـی لـه لایـه‌ن ئاشـوورییه‌كان و پاشـاكانی (حیپیـه‌كان لـه ئاسـیای بچـووك) بۆیـه ڕۆڵـی سیاسـیان كۆتایـی پـێ دێـت.

## پێنجه‌م : كاشییه‌كان

(لوڕسـتان) زێـدی ڕه‌سـه‌نی (كاشـییه‌كان) ه. ڕۆڵـی كاشـییه‌كان لـه (هـه‌زاره‌ی دووه‌مـی پ.ز) پـه‌ره‌ی سـه‌ند، به‌هـۆی كارو كاسـبیه‌وه كاری گشـتی له‌وانـه دوورینـه‌وه‌ی گه‌نـم ( ئه‌مـه له‌گـه‌ڵ كۆچكردنـی كـورد لـه سـاڵانی په‌نجـاو شه‌سـته‌كانی سـه‌ده‌ی رابـردوو بـۆ به‌غـدا بـه‌راوورد بكـه).
ژمـاره‌ی كاشـییه‌كان لـه وڵاتـی بابـل ڕووی لـه زیادبـوون بـووه، زۆربوونـی ژمـاره‌ی كاشـیه‌كان لـه‌و وڵاتـه‌دا بـووه هـۆی زیادبوونـی كاریگه‌ریـان لـه ژیانـی هاووڵاتیانـی (بابـل) بـه تایبه‌تـی لـه بـواری (ئابـووری) دا.
بـه‌ڵام كاتێـك (مورسـلیس یه‌كـه‌م) پاشـای حیپیـه‌كان لـه (١٥٩٦ پ.ز) په‌لاماری بابلـی داو كۆتایـی هێنـا بـه حوكمڕانـی بنه‌ماڵـه‌ی (حه‌موڕابـی)، بـووه هـۆی په‌یدابوونـی (بۆشـاییه‌كی سیاسـی) لـه بابـل، كاشـییه‌كان ئـه‌م هه‌له‌یـان قۆسـته‌وه و حوكمیـان گرتـه ده‌سـت، بـۆ مـاوه‌ی زیاتـر لـه چوارسـه‌ده (١٥٩٥ پ.ز - ١١٦٢ پ.ز) حوكمڕانـی وڵاتـی بابلیـان كـرد.

وڵاتـی بابـل لـە سـایەی حوکمڕانـی کاشـییەکان لە شـەڕ و ئـاژاوە دوورکەوتەوە و کەوتـە ژێـر سـایەی ژیانێکـی ئـارام و سـەقامگیرەوە، کاشـییەکان چەندیـن دیـاردەی شارسـتانیەکان هێنایـە (بابـل)، وەك بەکارهێنانـی (ئەسـپ ) و (گالیسـکە).
هەروەهـا کاشـیەکان ڕۆڵـی گرنگیـان بـووە لـە گۆڕینـی پەیوەندییەکانـی هێـزە سیاسـییەکانی ئەوکاتـەی ڕۆژهەڵاتـی نزیـك، میسـر بۆتە ناوەندێك بـۆ پەیوەندییە دبلۆماسـیەکان، ئـەو نامانـەی لـە (عەمارنـە) لـە میسـر دۆزراونەتـەوە ئاماژە بـەوە دەکـەن کـە کاشـیەکان خـەلات و دیارییـان لەگـەڵ ئاڵوگـۆڕ کـردوون، لـەو پەیوەندیانەشـدا کولتـووری بابلـی (کـە بریتییـە بـووە لـە بەکارهێنانـی زمانـی ئەکـەدی و نووسـینی بزمـاری) زمانـی دبلۆماسـیەت بـووە، هەروەهـا باسـی شـووکردنی خاتوونـە کاشـیەکان دەکـەن بـە میسـریەکان، پاشـاکانی کاشـیەکان خوشـك و کچـی خۆیـان داوە بـە فیرعەونەکانـی میسـر.
کاشـیەکان لەگـەڵ ئاشـوریەکاندا پەیوەنـدی ئاشـتیانەیان پیادەکـردوە پەیمانـی، ڕێکخسـتنی سـنووریان مۆرکـردوە ، پاشـاکانی کاشـیەکان خاتوونـی ئاشـووریان هێناوە.
کاشـیەکان پـاش سـەقامگیربوون ڕەوشـی گشـتی وڵات شـارێکی نوێیـان بنیاتنـا تـا ببێتـە پایەتەختیـان، ناویـان نـاوە (دورکوریکالـزو) بـە نـاوی پاشـاکەیان (کوریکالـزوی دووەم).. پاشـماوەی ئـەم شـارە ئەمـڕۆ دەکەوێتـە باشـووری ڕۆژئـاوای شـاری بەغـداد بـە نزیکـەی (٢٣ کـم)، پێـی دەڵێـن (عەقرقـوف).
کۆشـك و پەرسـگایان تیـادا بنیاتنـاوە کـە بـە پتـەوی بـە ناوبانـگ بـوون و ئەسـتووری دیوارەکانیـان زیاتـر لـە (٢ پـێ) بـووە، قـوڕ و خشـتیان لـە بنیاتنانـدا بەکارهێنـاوە، شەقامەکانیشـیان بـە خشـت کـردووە، لـە گرنگتریـن شـوێنەوارەکانی ئـەم شـارە، زەقـورەی (عەقرقـوف) ە، تاکـو ئێسـتا هاووڵاتییـە جێنشـینەکانی ئـەو دەوروبـەرە بـە پاشـماوەی شـارەکە دەڵێـن (گەڕەکـی کـوردان).
کاشـیەکان سیسـتەمێکی پێشـکەوتووی کشـتوکاڵیان دامەزرانـد، پاشـاکان

زەویـان بەسـەر سـەرۆك هـۆزەكان دابەشـكردووە، نیشـانە و سـنووریان لـە نێـوان زەوی تـاك و كۆمەڵەكانـدا دانـاوە. بایەخیـان بـە جۆگەكانـی ئاودێـری داوە. شـێوازی بەرهەمهێنانـی كشـتوكاڵ پـەرەی سـەندووە بووەتـە شـێوازێكی نیمچـە دەرەبەگـی. ئەمـەش بـووە هـۆی زۆربوونـی بەرهەمهێنـان و جێنشـینبوونی دانیشـتوان و پتەوبوونـی پەیوەندیـان بـە دەسـەڵات، بۆیـە حوكمڕانـی كاشـیەكان ماوەیەكـی درێـژی خایانـد.

## شەشەم : دەوڵەتی ئۆراتۆ

ئـەم دەوڵەتـە لـە سـەدەی نۆیەمـی پ.ز لـە ناوچـەی دەریاچـەی (وان) دامـەزرا. بۆیـە هەندێـك لـە مێژوونووسـان بـە دەوڵەتـی (وان) نـاوی دەبـەن. نانـراوە بـە (دەوڵەتـی ئۆراتـۆ) بەهـۆی چیاكانـی (ئـارارات).

ئوراتویـەكان توانیـان هاوپەیمانیـەك پێكبێنـن، هەمـوو نەتـەوە میرنشـینە كوردسـتانیەكان بگرێتـە خـۆ، لەگـەڵ میرنشـینی ڕەوانـدز هاوپەیمـان بـوون، ئەم میرنشـینە لـە سـەرچاوە ئاشـووریەكان نـاوی (مەساسـیر) ی لێنـراوە، هەروەهـا لەگـەڵ هـۆزە میدیـەكان پێكهاتـن و كۆنترۆڵـی ڕێگەوبانـی بازرگانیـان كـرد. ئۆراتۆیـەكان بـەم شـێوەیە هەڕەشـەیان لـە بەرژەوەندیەكانـی ئاشـوورییەكان دەكـرد، بۆیـە ئەوانیـش چەندیـن جـار هەڵمەتیـان بـردە سـەریان.

بە ناوبانگترین پاشاكانی ئۆراتۆیەكان وەكو شا (سردور) و شا (ڕۆسا).

ئۆراتۆیـەكان دەسـتی باڵایـان لـە ئاوەدانـكاری هەبـووە شـوێنەوارەكانیان لـە دەوروبـەری دەریاچـەی (وان) گەواهـی ئـەم ڕاسـتییەن. جۆگـەی ئاودێریـان لێـداوە. بەهـۆی لێزانـی و بەهرەمەنـدی ئۆراتۆیـەكان لـە بیناسـازی، پاشـای ئاشـووری (ناسـر بالـی دووەم ٨٨٣ - ٨٥٩ پ.ز) پەنـای بـۆ بـردوون بـۆ بەڕێوەبردنـی هەڵمەتـی ئـاواكاری فـراوان لـە كاتـی نۆژەنكردنـەوەی پایتەختەكـەی شـاری كەلخـو (نەمـرود).

(میدیەکان) لە ناوچەکانی باشووری ڕۆژئاوای دەریاچەی (ورمێ) لە سەدەی نۆیەمی پ.ز جێنشین بوون، شاری ئەکبەتانە (هەمەدانی ئێستا) یان کردە پایەتەختی خۆیان.

(هیردۆتس) مێژوونووسی یۆنانی، ئاماژە بەو شارە دەکات و دەڵێت: زۆر جوان و ڕێك و پێك بووەو، بە شووره دەورەدراوا بوو، لە ناوەندی شوورەکان شا دیوسیس (دیاکۆ) کۆشکی خۆی بنیاتناوە.

میدیەکان باری کارگێڕشیان ڕێکخستووە و گەشەیانداوە بە (پۆستە) و گالیسکەی جەنگی، شمشێری کەوانەیە و کەوانی مەزنیان دروست کردوە بۆ هاویشتنی (تیر) بۆ مەودایەکی درێژ، جگە لەوەش تیرەکانیان قەبارەی گەورەتر بوو خێرا دەگەیشتنە جێگەی مەبەست. هەندێ دیاردەیان لە (ئاشوورییەکانی) دراوسێیانەوە وەرگرتووە وەك هونەری جەنگ و پیشەسازی چەك.

لە بەناوبانگترین پاشاکانیا وەك شا (دیاکۆ) کە بە بنیاتنەری دەوڵەت دادەنرێت، شاری (ئەکبەتانە) ی بنیاتناوە، شا فراورتیس (خاشاپریتا) و شا کەیخەسرەو و شا ئەستیاکس .

شا (کەیخسەرو) توانی سوپایەکی بەهێز دابمەزرێت، و هۆزەکانی (ئەسکیپ) ی بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆی پاشان پەیمانی لەگەڵ پاشای(بابل) شا (ئەنبوبلاسەر) بەستووە، ئەم پەیوەندییە بەهۆی مێردکردنی کچی (کەیخسرەو) بە ناوی (ئەمیتس) بە کوڕی شای بابل (نبوخزنەسەر)، ڕووی لە بەهێزبوون کرد.

دەوڵەتی (میدیەکان) پاش گرتنی شارە ئاشووریەکان وەکو ئاشوور و کەلخ و نەینەوا، لە نێوان سالانی (٦١٤ - ٦١٢ پ.ز) گەیشتە لوتکەی هێز قەڵەمڕەوی ئیمپراتۆریەتی میدیەکان لە ڕۆژئاوادا ناوەندی ئاسیای بچووك و لە باشوور گەیشتە شاری تکریت، بۆیە میدیەکان لە ڕۆژهەڵاتی نزیکدا

بوونە یەکەم هێزی سیاسی و سەربازی و دەستیان گرت بەسەر ڕێگە بازرگانییەکان.
شایەنی باسە گەلی کورد ساڵگەردی دامەزراندنی دەوڵەتی میدیەکان (مادەکان) لە دەوروبەری (٧٠٠ پ.ز) کردۆتە سەرەتای ساڵنامەی (کوردی).

## هەشتەم : (کاردۆخیەکان)

مێژوونووسی گریکی (زەینەفون) ناوی (کاردۆکی یان کاردۆخی) لە دانیشتوانی کوردستان ناوە، ئەویش لە پەرتوکەکەی کە ناوی (ئەناباسیس - بەرەو باکوور)ە.
(زەینەفون) لەگەڵ (١٠) هەزار سەربازی گریکی لە (بە کرێگیراوەکان - مرتزقە) لە ساڵی ٤٠١ پ.ز بە وڵاتی کوردستان گوزەر دەکەن.
(زەینەفون) باس لە کشانەوەی ئەو (١٠) هەزار سەربازە دەکات لە وڵاتی بابلەوە بەرەو باکوور، شان بەشانی کەناری ڕووباری (دیجلە)، ئاماژە بەوە دەکات بەناو نەتەوەیەکە تێپەربوون، ناویان (کاردۆخی) یە...
دەڵێت: ئەمانە لە دەشتەکان و لە پاینی چیاکان دەژیان و گوندی ئاوەدانیان هەبووە، خانووەکانیان پڕ بوو لە گەنم و خۆراکی هەموو جۆرو گۆزەی مەی، هەروەها دەڵێت ئەمانە زۆر دلێرانە بەرگریان لە ماڵ و کەلوپەلیان کرد، چەندین سەربازی گریکیان کوشت، سوپای گریك پێویستی بە ٧ ڕۆژ بوو بۆ تێپەربوون بە زەوی کاردۆخییەکان.
وا دیارە (زەینەفون) و سوپاکەی چیاکانی زاخۆ (بێخێر) یان بڕیوە، دووچاری بەرگری کوردان بوونە بە تایبەتی لە دەشتی هەردوو قەزای سێمێل و زاخۆ..

## ٣- گرنگترین دیاردە شارستانییەکانی کوردستان

پێشتر زانیمان کە کوردستان لانکەی یەکەمی پەیدابوونی شارستانییەت بووە و مرۆڤ لەم پێگە جوگرافیایەدا کشتوکاڵی دۆزیەوەکە بووە هۆی وەرچەرخانێك لە ژیانی مرۆڤایەتیدا و وای لێکرد کە کۆببنەوە و پێکەوە بژین و کۆمەڵگا بهێنن و پاشانیش مرۆڤ کەوتە ڕێکخستنی کۆمەڵگا و گەشەپێدانی ئامێرو کەرەسەکان و ئاڵوگۆڕی بازرگانی، هەروەها بووە سەرهەڵدانی بنەماکانی ئایینی، بۆ پڕکردنەوەی پێداویستییە هزرییەکانی مرۆڤ، بەڵام زیادبوونی ژمارەی دانیشتوان و سەرکەوتنی مرۆڤ لە گەشەپێدانی هۆیەکانی بەرهەمهێنان و پاشانیش فێربوونی ئاودێری وایکرد بیر لە ناوچە و دەشتی فراوانتر بکاتەوە و کۆچی بۆ بکات، ئەوەبوو دانیشتوانی کوردستان بەرەو ناوەند و باشووری عێراقی کۆچیان کرد، لەو ناوچانە چەندین مەڵبەندی گەورەی شارستانییتی (شار) بنیاتنا و سیستەمی حوکمرانی دانرا، و نووسینیان دۆزیەوە.

ژمارەیەك لە توێژەروان لەو باوەڕەدان کە سۆمەریانەی لە باشووری عێراقدا شارستانییەتی پێشکەوتوویان بنیاتنا یەکێکن لە دانیشتوانی دێرینی کوردستان، ئەوانە دوای ژمارەیان زیادی کردووە قۆناغ بەرەو باشووری عێراق کۆچیان کردووە، ئەمەش ماوەیەکی زۆری خایاندووە، بەڵگە شوێنەواریەکان راستی گواستنەوەی مەڵبەندە شارستانییەکان لە کوردستانەوە بەرەو باشووری عێراق دەسەلمێنن.

لە کۆتایی (هەزارەی پێنجەمی پ.ز) باشووری عێراق بۆتە مەڵبەندێك بۆ (ڕاکێشتنی دانیشتوان) ئیتر گوندەکان گەشەیان سەندووەو بوونەتە شارۆچکە و شار، هەر شارێك دەوڵەتۆکەی تایبەتی تێدا دامەزرا، پێیان وترا (دەوڵەتۆکەکانی شارە سۆمەریەکان). ئەو سەردەمە پێی وترا: (سەردەمی بەرەبەیانی بنەماڵە سۆمەریەکان) پاشان دەوڵەتی ناوەندی لە ناوەند و باشووری عێراق دەرکەوت، لەوانەش: (دەوڵەتی ئەکەدی ٢٣٧١ - ٢٢٣٠ پ.ز) بۆیە

پاشـتر دۆخەکـە گـۆڕا، ئەمجارەیـان لـە ناوەنـد و باشـووری عێراقـەوە دیـاردە شارسـتانییەکانی وەکـو نووسـینی یاسـا و سیسـتەمی حکومڕانـی، بـەرەو ناوچەکانـی دراوسـێی عێـراق گوێزرانـەوە لەوانـەش (کوردسـتان).
دانیشتوانی (کوردستان) زۆر دیاردەی و ئەکەدییەکان و بابلییەکان و ئاشوورییەکان، ئەمـەش سروشـتی شارسـتانیانە زیادکـرد، ئەمـەش بەهـۆی دەوڵەمەنـدی خاکـی کوردسـتان بـە کەرەسـتە سـەرەتاییەکانی بنیادنانـی شارسـتانییەت وەکـو بـەرد و تەختـە و کانـزا، بـە پێچەوانـەوە ژینگـەی (ناوەنـد و باشـوور) لـەم رووەوە تـا ڕادەیـەك هەژاریـان پێـوە دیاربـووە..
هەمیشـە خاکـی کوردسـتان بۆتـە سـەرچاوەی کەرەسـە سـەرەتاییەکانی بنیادنانـی شارسـتانییەت، بۆیـە دانیشـتوانی ناوەنـد و باشـووری عێـراق چ بەهـۆی بازرگانـی بێـت یـان بەهـۆی داگیرکـردن و پەلامـاردان بێـت بەدەسـتیان هێنـاون.
بەهـۆی لێکچوونـی دیـاردە شارسـتانیەکان لای دانیشـتوانی کوردسـتان و دۆڵـی دوو ئـاوان و ناوچەکانـی دراوسـێیان بـاس لـەو دیاردانـە دەکەیـن کـە لـە زۆربـەی ناوچەکانـی ڕۆژهەڵاتـی نزیکـدا هەبـوون، ئەمـەش لـە میانـەی باسـکردنی دیـاردە شارسـتانیەکانی دۆڵـی رافیدەیـن، بـەڵام لەبـەر ئـەوەی ئایینـی زەردەشـتی تەنهـا لـە کوردسـتان و ئێرانـدا بڵاوبووەتـەوە و بـە شـێوەیەکی فـراوان لـە دۆڵـی رافیدەیـن و ناوچەکانـی تـر بڵاونەبۆتـەوە، بـە کورتـی باسـی لێـوە دەکەیـن:

## ئایینی زەردەشتەکان:

میللەتانـی هینـد و ئەوروپیـەکان، هـەروەك دانیشـتوانی دۆڵـی میزۆپۆتامیـا - دۆڵـی رشـافیدەین، دیـاردە سروشـتیە کاریگەرەکانیـان دەپەرسـت وەکـو (ڕۆژ و زەوی و هـەوا... هتـد) لـە خواوەندەکانیـان وەکـو خواوەنـدی (تیشـووب) بەرامبـەر بـە خواوەنـدی (ئەنلیـل) لـە دۆڵـی ڕافیدەیـن. و (شاوشـکا) بەرامبـەر (عەشـتار) ی بابلـی و خواوەنـدی ڕۆژ (میپـرا). ئـەم خواوەنـدە ڕۆڵـی بەرچـاوی لـە هـزری هینـد و ئەوروپاییـەکان بـوو.
لـە کۆتایـی سـەدەی حەوتەمـی پ.ز، لـە وڵاتـی میدیـا کەسـێك بـە نـاوی (زەردەشـت) دەرکـەوت، داوای لـە خەڵکـی کـرد تەنهـا یـەك خـوا بپەرسـتن،

ئەویش خواوەند (ئەهورامەزاد) یە کە خواوەندی (ڕووناکی و چاکە) یە. دانیشتوانی (میدیا) لە سەرەتا باوەڕیان پێ نەکرد. بۆیە کۆچی کرد بۆ ڕۆژهەڵاتی ئێران، لە شاری (بەلەخ) و دەوروبەری بانگەوازەکەی بڵاوکردەوە.

پاش دامەزراندنی دەوڵەتی ئەخمینی لە ئێران، شا دارای یەکەم (٥٢٢ - ٤٨٦ پ.ز) ئایینی زەردەشتی کردە ئایینی فەرمی دەوڵەت، بۆیە ئایینی تازە لە نێو دانیشتوانی کوردستان و ئێران و ناوچەی تر بڵاوبووەوە.

بیروباوەڕی زەردەشتیان لەسەر بنەمای بانگەشەکردن بۆ چاکە و دووركەوتنەوە لە خراپە دامەزراوە.

(ئەهریمەن) بەلایەنەوە خواوەندی (شەڕوخراپە) یە شوێنکەوتوانیشی لە مرۆڤ هەیە. زەردەشت ئەوەشی ڕوون کردۆتەوە کە خوازیارانی (ئەهورامەزدا) وتا خواوەندی چاکە ڕووناکی و شوێنکەووتوانی سەرکەوتن بە دەست دێنن بەسەر ئەهریمەن و شوێنکەوتوانی، بۆیە زەرادەشتی هەناوێکی گرنگ بووە بۆ باوەڕهێنان بە یەکتاپەرستی.

بیروباوەڕەکانی زەردەشت لە تۆمارێکدا بە ناوی (ئاڤێستا) پیاوە ئایینەکانی زەردەشتی چەندین ڕاڤە و شرۆڤەیان بۆ داناوە. لە پەرستگاکانی نزایان دەخوێند نوێژیان دەکرد و ئاگریان بەردەوام لە گڕکردن بووە، چونکە ئەم ئاگرە توخمێکی پیرۆز بووە لە ئایینەکەیان.

ئەم ئایینە بە زۆری ئایینی چینی دەسەڵاتدار بوو، بۆیە لە ناو جەماوەری خەڵکیدا بڵاونەبۆوە وەك ئایینی (بوزا) بۆیە شوێنکەوتوانی کەم بووەوە، لەگەڵ دەرکەوتنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام زۆربەی لایەنگرانی زەردەشت هاتنە سەر ئایینی ئیسلام و ئێستاش ژمارەیەکی کەم لە ئێران (کە لە شاری یەزد کۆبوونەتەوە) و هیندستان لەسەر ئەم ئایینە ماون و لە پلەیەکی بەرزی گوێڕایەڵی و خاوێنی دان. شایانی باسە کە ئایینەکەیان لە ئایینە داخراوەکان دەژمێردرێت.

## پـرسـيارەكان

١- بۆچی دانیشتوانی کوردستان لە دۆزینەوەی کشتوکاڵدا پێش ناوچەکانی تری جیهان کەوتن؟

٢- بایەخی شارستانێتی گردی حەلەف روونبکەرەوە؟

٣- ئەو دیارە شارستانێتیانە کامانە بوون کە میتانیەکان لەگەڵ خۆیاندا هێنایانە رۆژهەڵاتی نزیك؟

٤- کاردۆخییەکان کێن؟ پەیوەندیان بە ئەغریقیەکانەوە چۆن بووە؟ دیاردە شارستانێتیەکانیان بوون؟

# سەرچاوەکانی بەشی یەکەم

## یەکەم : سەرچاوە کوردییەکان

١- **محمـد امین زکی** : خلاصەیەکی تاریخی کوردو کوردستان، بەغدا ١٩٣١.

٢- **جمال رشید احمد** : لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی دەربارەی مێژووی وڵاتی کوردەواری، دار الحرية، بغداد ١٩٨٨.

## دووەم : سەرچاوە عەرەبییەکان

١- **جمال رشيد احمد** : دراسات كوردية في بلاد سورباتو، بغداد ١٩٤٨

٢- **جورج رو:** العراق القديم، ترجمة حسين علوان، بغداد ١٩٨٠

٣- **طه باقر:** مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة، ط٣، بغداد ١٩٧٣

٤- **نخبة من الباحثين:** حضارة العراق، بغداد ١٩٨٥

# بەشی دووەم



## شارستانییەتی دۆڵی دووڕووبار (میزۆپۆتامیا) (الرافدین):

هـەر لـە کۆنـەوە چەندیـن کۆمەڵـی مرۆیـی لـە میزۆپۆتامیـا نیشـتەجێبوون، جیاجیـاو پێکـەوە بەشـداریان لـە بنیاتنانـی شارسـتانییەتدا کـردووە.

دۆڵی دووئـاوان دەڤەرێکـی کـراوە بـوو لەبـەردەم هاتنـی شـەپۆڵە مرۆییـە یـەك لـە دوای یەکـەکان. کـە لـە ڕۆژئـاواو باشـووری ڕۆژئـاواوە نەتەوەکانـی نیمچـە دوورگـەی عـەرەب (نەتـەوە سـامیەکان) و لـە دۆڵـی (فـوراتـ) ەوە ڕوویـان کـردە عێـراق.

هـاوکات چەندیـن شـەپۆڵی مرۆیـی تـر لـە ڕۆژهەڵاتـەوە بـە دۆڵـی دیجلـەدا تێپەڕیـوون دەهاتنـە نـاو عێراقـەوە ئەوانیـش (نەتـەوە هینـدۆ ئەورووپیـەکان). ئـەم شـەپۆڵانە لەگـەڵ دانیشـتوانە ڕەسـەنەکانی وڵات وەکـو سـۆمەریەکان و لولوبیـەکان و گوتییـەکان و خورییـەکان تێکـەڵ بـوون.. ئـەم تێکەڵبوونـە بووەتە مایـەی ئاڵوگـۆڕی شـارەزایی و ڕاو هـزر، بۆیـە شارسـتانییەتی دۆڵـی ڕافیدەیـن پێـی کاریگـەر بـوون و کاریگەریـان لەسـەر هەبـووە.

هەرچەنـدە سـۆمەریەکان بـە داهێنـەری بناغـەی شارسـتانێتی پێشـکەتوو دادەنرێـن، ئـەوان لـە بـواری بیناسـازی و کشـتوکاڵ و ئاودێـری و داهێنانـی نووسـین دەسـتی باڵایـان هەبـووە، بـەڵام ئـەو نەتەوانـەی کـە لـە دەرەوە هاتنـە ناوچەیەکەیانـەوە شـتی تریـان پێبوو، شارسـتانییەتیان دەوڵەمەند کرد و گەشـەیان پێـدا بـە شـێوەیەك کـە لەگەڵیـان بگونجـێ، بۆیـە دەتوانیـن بڵێیـن شارسـتانییەتی دۆڵـی دوو ئـاوان مۆرکـی نێونەتەوەیـی مرۆڤایەتـی هەبـوو. پاشـتریش بـووە کەناڵێکـی شارسـتانییەتی جیهـان..

## گرنگترین دیاردە شارستانیەکان:

### یەکەم : سیستەمی حوکمڕانی:

#### أ- پەیدابوونی سیستەمی حوکمڕانی:

مەبەست لە سیستەمی حوکمڕانی، شێوازی کارگێڕی و بەڕێوەبەردنی شار یان دەوڵەتە کە لە چەندین شارۆچکە و گوندەکان پێکهاتووە، هەروەها جۆری دەسەڵات کە ئەو کارگێڕییە دەگرێتە ئەستۆ.

بە گشتی زەحمەتە باس لە یەکەمین سیستەمی حوکمڕانی عێراق بکرێت و ئەوەشی کە توێژەرەوان لەم بارەوە باسیان کردوون دەچنە بواری خەملاندن و گریمانەوە، بنەماڵە فەرمانڕەواکان دەکەن کە لە دێرین زەماندا حوکمڕانیان کردووە، بۆیە مەزەندە دەکرێت، پێش دۆزینەوەی (نووسین) جۆرێکی حوکمڕانی هەبوو.

پەرەسەندنی سیستەمی حوکمڕانی بەلای سومەریەکان لە چاخە مێژووییەکان گەواهی ڕەگ داکوتانی ئەم سیستەمەیە لە زەمانێکی کۆنترەوە سەریهەڵداوە. دژواری ژینگەی باشووری عێراق کە لە کەمی باران و بەرزی پلەکانی گەرما لە هاوین و لافاو لە بەهار خۆی دەنوێنێ.. کاریگەریان لە هاندانی دانیشتوانی ئەو ناوچەیە بووە بۆ ئەوەی هاوکاری یەکتر بکەن بەرامبەر ئەو دژواری و نەهامەتییە.. پێکەوە بۆ بنیاتنانی بەربەست و بەنداو هەڵکەندنی جۆگە و جۆگەڵە کاریان کردووە. جگە لە هەماهەنگی و کاری هاوبەش بۆ پاراستنی گوند و کێڵگەکانیان.

وەك دەزانین ئەم جۆرە کارانە پێویستیان بە کەسانێك هەیە سەرپەرشتیارێك ئەرکی ڕێکخستنیان بگرێتە ئەستۆ، خەڵکی ئەو سەردەمە باوەڕیان بە پیاوە ئاینییەکان زۆر پتەو بوو، وایاندەزانی ئەوان لە هەموو شتێك دەزانن وەکو ڕوودانی لافاو یان بەرپابوونی پەلاماردان، چونکە پیاوە ئاینییەکان لە پەرستگاکان دەژین و خزمەتی خواوەندەکان دەکەن و، لە پەیکەری خواوەندەکەیانەوە نزیکن.

بە پێی بیروباوەڕی ئەوانیش هەڵبژاردنی پیاوی ئایینی بەلایانەوە ئەرکێکی خوداییە، بۆیە پیاوی ئاینی (کاهن) یان دەست نیشاندەکرد بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری دنیاییان جگە لەوەی کە بە کاروباری ئایینیش هەڵدەستان. بەو پیاوە ئاینیە (کاهن - ئاخوند) ی سەرکردایەتیانی دەکردن دەیانگوت (ئین En ) لە زمانی سۆمەریدا بە مانای (سەردار یان گەورە) دێت.

بەهۆی پەرەسەندن و پێشکەوتنی ژیان و زیادبوونی ژمارەی دانیشتوان پیاوی ئاینی En ئەرکە ئایینی و دونیاییەکانی زیادی کرد، بۆیە پێی نەدەکرا ئەرکەکانی بەڕێکی جێ بەجێبکات ناچار بوو یاریدەر بۆ خۆی دابنێ بۆ هاوکاریکردنی لە ئەنجامدانی ئەو ئەرکانە، خۆشی چۆتە دەرەوەی (پەرستگا)، کۆشکی بنیاتناوە، خزمەتگوزار و پاسەوان و بەردەست ڕاگرتووە و خەڵکانی تریشی بۆ خوشگوزەرانی و ڕابواردن وەکو چێشت لێنەر و ئاوگێڕو سترانبێژ و مۆسیقاژەن، ڕاگرتوو.

نازناوی حاکمی نوێ گۆڕا و لە زمانی سۆمەریدا (ئینسی - Ensi) پێدەوت بە مانای (جێگیر یان بریکاری خواوەند) بە فەرمانی خواوەند، هاتووە.

بەشێوەیەکی ئاسایی (En) یان (Ensi) حوکمڕانی یەك شاری دەکرد. بەهۆی گۆڕانی باری سیاسی دەسەڵاتی حوکمڕان (حاکم) فراوانتر بوو، زیاتر لە شارێك کەوتە بن دەستی. ئەو حاکمە کە حوکمڕانی چەند شارێکی دەکرد پێیان دەوت (لوگاڵ) لە زمانی سۆمەریدا مانای (پیاوی مەزن یان پاشا) دەبەخشێت. بەرامبەر وشەی (لوگاڵ) لە زمانی سۆمەریدا وشەی (شڕو- shurru) لە زمانی ئەکەدیدا بەکارهاتووە.

## ب- دیموکراتیەتی سەرەتایی : primitive democracy

هەندێك لە پسپۆرانی مێژوو لەو باوەڕەدان، کە یەکەمین سیستەمی حوکمرانی لە شارە سۆمەریەکان، شێوەیەکی دیموکراسی هەبوو، بەڵام دیموکراسیەتێکی سەرەتایی. دەسەڵاتی باڵای شار لە دەستی ئەنجومەنێکی گشتی بوو، هەموو هاوولاتییە پێگەیشتووەکانی گرتبوەخۆ، ڕەنگە هەندێك ئافرەتیشی تێدا بوو بێ.

ئـەو ئەنجومەنـە لـە بارودۆخـی (نـاکاو) دا (طـوارئ ) کۆدەبـوەوە هەمـوو ئەندامێکیشـی مافـی قسـەو ڕا دەربڕینـی هەبـوو، بـەڵام بـە گشـتی ڕای پیـاوە بـە تەمەنـەکان پەسـندتر بـوو، بۆیـە پیـاوە بەتەمەنـەکان ئەنجومەنـی پیرانیـان پێکهێنـا.
لەنـاو ئەنجومەنـدا گفتوگـۆ بـەردەوام دەبـوو تـا دەگەیشـتنە بڕیـار بـە تێکـڕای دەنگـەکان، لـە کۆتاییـدا دارێژەرانـی یاسـا، بڕیارەکەیـان دەخوێنـدەوە.
هـەر ئـەم ئەنجومەنـە حاکمـی شـار (En) ی هەڵدەبـژارد و هەندێـك دەسـەڵاتی پـێ دەبەخشـتی، هەرچـی بڕیـارە گرنگەکانـی وەکـو بڕیـاری ڕاگەیاندنـی شـەڕ یـان ڕازیبـوون بـە ئاگربەسـت و ئاشـتی و پەیمـان بەسـتن ئەوە لە دەسـەڵاتەکانی خـودی ئەنجومـەن بـوو، بـەڵام بەرپابوونـی شـەڕ لـە نێـوان دەوڵەتۆکـەی شارە سۆمەریەکان و بەردەوامبوونـی بوونـە مایـەی لەناوچوونـی ئـەم جۆرە سیسـتەمە دیموکراسـیە، چونکـە لـە کاتـی شـەڕدا، ئەنجومەنـی شـار دەسـەڵاتی فراوانـی بـە حاکمـی شـار دەدا، بـە مەبەسـتی ڕووبەڕووبوونـەوەی دوژمنـان، حاکمـی شـاریش ئـەم دەسـەڵاتە فراوانـەی بـۆ سـوودی خـۆی بەکاردەهێنـا تەنانـەت دوای کۆتایـی پێکهاتنـی شـەڕیش، دەقۆزتـەوەو وازی لـێ نەدەهێنـا بەم شـێوەیە قۆنـاغ بـە قۆنـاغ سیسـتەمی حوکمڕانـی پشتاوپشـت پەیدابوو، جێگەی سیسـتەمی پێشـووی مانـەوە، بـەڵام پاشـاکان وایـان بڵاوکـردەوە کـە خواوەنـدەکان ئەوانیان نـاردووە چیـدی پێویسـت بـە کاری ئـەو جـۆرە ئەنجومەنانـە نەمـا، لـە ئاکامـدا هەڵوەشانەوە.

## ج- سیستەمی دەوڵەتی شار:

سۆمەرییەکان چەندیـن بنکـەی شارسـتانیان لـە باشـووری عێراقـدا دامەزرانـد، زۆر خێـرا گەشـەیان سـەندو کەوتنە پێشـبڕکێی یەکتـر لـە ڕووەکانـی ئابـووری و سیاسـیەوە، ئـەم پێشـبڕکێیە چەندیـن شـەڕی لێکەوتـەوە. لە ئاکامدا دەسـەڵات لـە دەسـتی سـۆمەرییەکان دەرچـووە، چـووە دەسـتی (نەتـەوە سـامیەکان) لەوانـە ئەکەدییـەکان لـە نیـوەی دووەمـی هـەزارەی سـێیەمی پ.ز بوونەتـە خـاوەن دەسـەڵات.

گرنگترین ئەو بنکە و مەڵبەندە شارستانیانە کە سۆمەریەکان بنیاتیان نابوو وەکو « ئەریدو، وەرکا، لەگش، ئوما، نوفەر، کیش»..
هەموو شارێك خواوەندی تایبەتی خۆی و، شوورەی بەرگری و حاکمی سەربەخۆی هەبوو.. شار ئەمانەی خوارەوە پێکهاتەی بوو:

**١- ناوەندی شار:**

پەرستگای سەرەکی و کۆشکی پاشا لەم ناوەندە بوو، ئەم ناوەندە ناوەندی چالاکی ئابووری و ئایینی پیرۆز بوو. خانووەکان لە دەوریدا بڵاودەبنەوە، تۆڕێك لە ڕێگەو کۆڵان و ناوەند و گەڕەکانی شار پێکەوە گرێدەدا.. لە نموونەی ئەم پەرستگانە، پەرستگای خواوەندی (ئەلنیل) لە شاری (نۆفەر).

**٢- دەوروپشتی شار:**

دەوروبەری شاریش گوندەکانی دەگرتەوە، کە کێڵگە و لەوەڕگەکانی تێدابوو، ئەمانەش سەرچاوەی سەرەکی خۆراکی دانیشتوان بوون.

**٣- بەندەری شار:**

ئەمەش مەڵبەندی بازرگانی بوو، بازرگانیەکان تییدا جێنشین بوون. بەندەر شێوە سەربەخۆیەکی هەبوو، مەبەستی بازرگانی کردن و گواستنەوەی شمەك لە شار و بۆ دەرەوە وبە پێچەوانەش.

### د- سیستەمی پاشایەتی:

داستانە سۆمەریەکان ئاماژە بەوە دەکەن، کە پاشایەتی لە ئاسمان بوو، تاج و سولجان و داری دەسەڵات لەوێ خراوەتە پێش خواوەند (ئانۆ)، یەکەمین کەس کەبوتە پاشا لە ئاسمان خواوەند (ئەلنیل) بوو، بەڵام کاتێك خواوەندەکان « مرۆڤ « یان خەلق کرد، پاشایەتیان بە مرۆڤ بەخشی، بۆ ئەوەی کاروباری خۆیان ڕاپەڕێنن و خزمەتی خواوەندەکانیش بکەن.
بۆیە فەرمانی پاشا فەرمانێکی خودایيە، هەرچەندە پاشا مرۆڤە، بەڵام (پاشا)

ی (مرۆڤ) دەبێتە جێگری (خواوەند) بۆیە گوێڕایەڵی ئەرك و پێویستە.
هەندێك لە پاشاكانی عێراق هەوڵیان دا، ببن بەخواوەند، بەڵام هەوڵەكانیان سەرنەكەوت. لەوانەش شاكانی ئەكەدی وەك شا(سەرجۆن) و (نەرام سین) و شاكانی بنەماڵی ئوری سێیەمی سۆمەری وەك شا(شولكی).. هەرچەندە بیرۆكەی بوونی پاشا بە خواوەند لە میسر سەركەوتوو بوو، بەڵام لە دۆڵی دووئاوان چارەنووسی جودا بوو.

## هـ- نازناوەكانی پاشا:

نازناوەكانی پاشا لەبەر ڕۆشنایی پەرەسەندنی هێزو دەسەڵاتیان گەشەی دەسەند و دەگۆڕا لەسەردەمی سۆمەرییەكان نازناوی(پاشای چوارلا)ی لە خۆنا. ئەم نازناوە بەڵگەی فراوانبوونی دەسەڵات بوو، چونكە ئەم نازناوە تایبەت بوو بە خواوەندەكان.
پاشاكانی بنەماڵەی (ئووری سێیەم) نازناوی پاشای (سۆمەری و ئەكەد)یان هەڵگرت، هەروەها نازناوی(پاشای وڵاتی بابل و پاشای وڵاتی ئاشوور) بەدەركەوت. جگە لە چەندین نازناوی پڕ لە شكۆمەندی وەكو (پاشای هەموو پاشاكان) (پاشای جیهان) یان نازناوی (چاودێری دڵسۆز، عەودالی هەق و دادوەر).

## و- پاشای جێگرەوە:

لەبەر گرنگی پایەی (پاشا) ئەركە دنیایی و ئایینی بەو ڕاسپێرابوو، و نوێنەری ئاینی باڵا (كاهینی یەكەم)یش بوو، و بەرپرسی كارگێڕی و سەرۆكی دادوەرەكان و سوپاسالار بوو، بۆیە هەر مەترسیەك هەڕەشەی لە ژیانی پاشا بكردیا، دەبووە مایەی ئاژاوەو وڵات و دەكەوتە مەترسیەوە، لەبەر ئەوە پێویست بوو سەلامەتی پاشا بپارێزرێت.
هەندێك لە ڕووداوەكان بۆ دانیشتوانی ئەم سەردەمە وەكو ڕوودانی (گیرانی خۆرو مانگ) سەرچاوەی ڕەشبینی بوون، هەر كاتێك (كاهین) هەستی بە

مەترسیەکی وا دەکرد، یەکسەر دەبوایە(پاشا) لەبەر چاوان ون بکرێت، بۆ ماوەی مانگێك تا ٣ مانگ. لەم ماوەیە جێگیریەکیان بۆ دادەنا. دەسەڵاتی پێدەدراو لە کۆشکی پاشا جێگری دەبوو، پاشان کۆتایی هاتنی ماوەی (هەڕەشە) یا (ترسە) چاوەڕوانکراوەکە، پاشای جێگیرەوە دەکوژرا. بۆ ئەوەی هەموو مەترسییەکان لەگەڵ خۆی ببات و پاشای ڕەسەن دەهاتەوە جێگەی خۆی.

هەندێك لە توێژینەرەوەکان شێوازی (پاشای جێگیرەوە)یان بە هەنگاوێکی ژیرانەی پاشاکان لێکداوەتەوە کە هەندێکیان بە هاوکاری پیاوە ئاینیەکان پیادەیان دەکرد بۆ خۆ ڕزگارکردن لە بەرهەڵستکاران.

## ز- کارگێڕی:

پاشا بەتەنها هەموو کارەکانی پێ هەڵنەدەسوڕا، بۆیە پێویست بوو هەندێك لە میرە نزیك و خزمەکانی خۆی یارمەتی بدەن. بەتایبەتی پاش فراوانبوونی سنووری دەوڵەت و زاڵبوون بەسەر دەڤەرەکانی دەوروبەری دۆڵی(دووئاوان).

پاشا دێرینەکانی عێراق لە وڵاتی بابل و ئاشووردا شێوازی کارگێڕی مەرکەزیان بەکار دەهێنا پاشا وڵاتی دەکردە چەند هەرێمێکی کارگێڕی، بۆ هەرێمێك پاشایەکی دادەنا ڕاستەوخۆ بەخودی پاشای گەورە گرێدرابوو.. یان لەو فرمان و دەسەڵاتی وەردەگرت.

پاشاکان بنەماڵەی ئووری سێیەم پەنایان بە گواستەوەی میری شارەکان بردووە. واتا حاکمی ناوە ماوەیەك لە شارێکەوە دەگوازرایەوە شارێکی دی، لە ترسی ئەوەی نەك پەیوەندی بە خەڵکی ناوچەکەوە پتەو بکات و لایەنگیری بکەن بۆ جیابوونەوە.

فەرمانڕەوای شار دەبوایە لەهەموو شتێکدا پاشای گەورە ئاگاردار بکات، لەکاتی ڕوودانی کارەساتێکی سروشتی یان لەکاتی ڕوودانی هێرشێکی دوژمناندا.

لەسەردەمی پاشای بابل (حامورابی ١٧٩٢-١٧٥٠ پ.ز) مەرکەزیەتی دەوڵەت

پـەرەی سـەند، کۆشـکی پاشا بۆتـە سـەرچاوەی یەکەمـی دەسەڵاتی(سیاسـی و کارگێـڕی و دارایـی) و فەرمانبـەران و کارگێـڕان کارەنیـان لـە کۆشـکدا ئەنجام دەدا. حەمورابـی هـەردوو دەسـەڵاتی لێـك جیاکردنـەوە.
بەرامبـەر بـە پەرسـەندنی دەسـەڵاتی (کۆشـك) و (پاشـا) دەسـەڵاتی (پەرسـتگا) و (کاهیـن) ڕووی لـە کزبـوون کـردو لـە کاروبـاری دنیایـی دوورخرانـەوە.
فەرمانـڕەوای شـار نازنـاوی (ڕابینـام- rabianum)ی هەڵگرت.بەمانـای (پارێـزگار یـان سـەرۆکی شـارەوانی)دێت.
پاشـا نوێنـەری خـۆی بـۆ هەرێمـەکان دەنـارد بـۆ ئـەوەی لـە چۆنیەتـی بەڕێوەچوونـی کارو چالاکییـەکان بەئـاگا بێـت.. هەندێـك جـار دەبوایـە فەرمانڕەوای شـار دەست و برد بانگهێشتی کۆشـکی پاشا بکرێت بەمەبەستی راپرسـی و وەرگرتنـی فەرمـان لـە پاشـاوە.
ئەمـەش نموونەیەکـە لـەو شـێوازە(حەمورابی) لەگـەڵ ئـەو کار بەدەسـتانەی بـەکاری هێناوە.((بەسین ئەدنیـام بڵـێ، حامورابـی دەڵێت: بە گەیشتنی نامەکەم، ڕاستەوخۆ ڕوو دەکەیتـە بابـل و لەپێـش بەبـێ دواکەوتـن ئامـادە دەبیـت)).
کارگێـڕی وڵات لەسـەردەمی (کاشـیەکان) پەردەدەسـتێنێت وڵات دابـەش بـوو بەسـەر (٢٠) هەرێـم، فەرمانـڕەوای (هەرێـم) بەرپـرس بـوو لـە کۆکردنـەوەی (بـاج) و چەسـپاندنی یاسـا و پاراسـتنی هێمنـی و ئاسـایش.
سیسـتەمی کارگێـڕی لەسـەردەمی ئاشـورییەکان لـە ڕووی ڕکخسـتن دەگاتـە پلـەی پێشـکەوتن، ژمارەیەکـی زۆر لـە فەرمانبـەران و میرەکان یارمەتی پاشـایان داوە، فەرمانبەرێتـی لـەو ماوەیـە دەبێتە(پشتاوپشـت)، فەرمانڕەوایـی یەکەمـی کارگێـڕی دەبوایـە ڕاپۆرتـی سـاڵانەی خـۆی ڕاسـتەوخۆ بـۆ پاشـا بنێرێـت.
ئاشـورییەکان سیسـتەمی (پۆسـتە) یـان پەرپێـدا، ئەمـەش دەبێتـە هـۆی بەخێرایـی گەیشـتنی فەرمانەکانـی پاشـا بـۆ فەرمانڕەواکانـی یەکـە کارگێڕییـەکان. هەروەها نوێنەرانـی پاشـا بـۆ پشـکنین سـەردانی هەرێمەکانیـان دەکـرد.
هەرچەنـدە کاروبـاری پەرسـتگاکان لەلایـەن پیـاوە ئایینـی (کاهن)ەکانـەوە بەڕێـوە دەچـوو، بـەڵام بنیاتنـان و نۆژەنکردنـەوەی پەرسـتگاکان هـەر لـە ئەسـتۆی پاشـاکان بـوو.

## دووەم: بیروباوەڕە ئایینیەکان

لەسـەردەمی بەردینـی کـۆن مـرۆڤ جۆرێـك لـە پەرسـتنی پیـادە کـردووە.
وێنـەی ئاژەڵـی دەکێشـا کـە لەکاتـی ڕاو کردنـدا بەتیـر پێکـراوە، دیـواری ئەشـکەوتەکان ئـەم جـۆرە وێنانـە دەکێشا، دیـارە مـرۆڤ وای بـاوەڕ دەکـرد ئـەم وێنەیـە یارمەتـی دەدات بـە ئاسـانی لـە ڕاوکردنـدا ئاژەڵـە کێوییـەکان ڕاوکات، چونکـە سـەرچاوەی خۆراکـی ئـەو بـوون.
پـاش ئـەوە لەسـەردەمی بەردینـی نـوێ دا، ئادەمیـزاد فێـری کشـتوکاڵ و ئاژەڵـی بەخێوکـردن بـوو، ئیتـر بەرهەمـە خۆراکییەکانـی زیـادی کـرد، ئـەم جارەیـان بیـری لـە بەپیتـی (خصوبة) و زۆربـوون (التکاثـر) کـردەوە.
بـاوەڕی وابـوو کـە زۆربوونـی ژمـارەی خێـزان و ئـاژەڵ و بەرهەمهێنانـی دانەوێڵـە بەنـدە بەچەنـد هێزێکـی نەدیتـراوەوە، کـە لەشـێوەی (خواوەنـدی مـێ) بەرجەسـتەی دەکـرد. بۆیـە ئەندامەکانـی زاوزێـی لەوێنـەی پەیکـەری مێینـەکان بـە زێدڕۆیـی گەورەتـر دروسـت دەکـرد. ئـەو پەیکەرانـە لـە قـووڕ دروسـت دەکـران، لای توێژینـەرەکان ئـەو پەیکەرانـە بـە (خواوەنـدی دایـك) وهێمـای (زاوزێ و زۆربـوون) ناسـراون.
(زۆربـوون و زاوزێ) بوونـە شـتێکی ئاشـنا بـەلای مرۆڤـەوە، بەهـۆی زۆربوونـی ژمـارە دانیشـتوان و گەشەسـەندنی بەرهەمهێنانـی کشـتوکاڵی و ئامرازەکانـی، بەتایبەتـی پـاش گەیشـتن و فێربـوون لـە گەشـەپێدانی ڕێگەکانـی ڕێگەکانـی ئاودێـری.
بۆیـە بیروبـاوەڕی مـرۆڤ ڕوو لـە هێـزە سروشـتییەکان کـرد، ڕاسـتەوخۆ کاریگەریـان لەسـەر ژیانـی مـرۆڤ هەبـوو وەکـو:(زەوی و هـەواو ڕۆژو مانـگ و ئەسـتێرەکان)، هەروەهـا بینـی کـە بـەرزو نزمـی زەوی و ئـاوو هـەواو لافـاوو نەخۆشـیەکان.. هەموویـان کاریگـەرن لـە ژیانـی ڕۆژانەیـان. بۆیـە مـرۆڤ بیـری کـردەوە کـە چەنـد هێزێکـی نەدیتـراو لـە پشـتی ئـەم هێـزە سروشـتییانەدا هەیـە و بزوێنـەری ئـەم هێزانـە دروسـت کـردوە لـە بینـای تایبەتیـدا دایناون کـە

پەرستگاکانن دەستی کردووە بە خزمەتکردنیان و پێشکەشکردنی و دیاری و قوربانی بەوپێیەی ئەمانەن خواوەندن.

ئادەمیزاد لەو باوەڕە دابوو، کە ئاسمان خواوەندی خۆی هەیە، زەویش خواوەندی خۆی، هەواو باران بارین و ئاو هەریەکەیان خواوەندیان هەیە. هەروەها جەنگ و خۆشەویستی و زەوی کێڵان و نووسین و جیهانی ئەو دنیا بەلای ئەوانەوە خواوەندی خۆیان هەبووە، هەروەها هەر شارو نەتەوەیەکیش خواوەندی پارێزەری خۆیان هەیە.

دەتوانین خەسڵەتەکانی بیروباوەڕە ئایینیەکانی مرۆڤی دێرینی عێراق بەم شێوەیە پوختە بکەین:

## أ- بنەمای هاوبەشی:

دانیشتوانی دۆڵی دووئاوان دوور بوون لەسەرەتای یەکتاپەرستی، ئەوان وایان بیر دەکرد کە خواوندێکی زۆر حوکمی لەسەر یانەوە هەیەو گەردوون دەبات بەڕێوە، هەموو خواوەندەکانیش چۆنیەك نەبوون بەڕووی گرنگیەوە. هەندێکیان ڕۆڵی لاوەکیان هەبوو، بۆیە پەرستگاکانیان بچووك لە گۆشەیەکی شاردا بنیات نرابوو هاوکات بایەخی زۆریان بە پەرستنی هەندێك لە خواوەندەکان دەدەن، وەکو خواوەندی(ڕۆژ).

## ب- بنەمای لێکچوون:

مەبەست ئەوەیە کە خواوەند بە مرۆڤ بشوبهێنین، زۆربەی سیفەت و خەسڵەتەکانی مرۆڤ بخەنە پاڵ خواوەندەوە، چ لە ڕووی شێوەی جەستەو ئەندامەکان یان لە ڕووی هزرو وسۆزو هەستەکانەوە. خواوەندەکان بە بۆچوونی مرۆڤی ئەو سەردەمە دەخۆن و دەخۆنەوە، ڕکابەری دەکەن و خۆشەویستی و ژن دەهێنن، خۆشی دەکەن و نیگەران دەبن، پەیوەندی کۆمەلاتیان هەیە، کۆدەبنەوە بڕیار دەدەن، لەوەیە جیاوازی ڕا بکەوێتە نێوانیان.

## گرنگترین خواوەندەکان:

**کۆمەڵەی یەکەم:** ئەو سێیانەی دەگرێتەوە کە سروشت بەرجستە دەکەن:

**١-ئانـۆ:** خواوەنـدی ئاسـمان، سـەروەری ئاسـمان و هێماکـەی ژمـارەی ٦٠ بـووە، یەکەیەکـی تـەواوە لـە بیروباوەڕی حیسابی سیسـتەمی سـۆمەریەکان(ئانۆ) باوەکـی هەمـوو خواوەنـدەکان بـوو، لەشـەڕی (وەرکا) دەیـان پەرسـت.

**٢-ئەنلیـل:** سـەروەری (هـەوا)، لـە داسـتانەکان و دروشـمە ئایینیەکانـدا ڕۆڵی مەزنـی هەیـە، هەروەهـا خواوەنـدی دەسـەڵاتیش بـووە. بۆیـە هەندێـك جـار ڕکابـەری لەگـەڵ (ئانـۆ) دەکات، هێماکـەی ژمـارەی ٥٠ بـووە، لـە شـاری (نوفـەر) دەیـان پەرسـت.

**٣-ئەنکـی:** خواوەنـدی (زەوی)، هێماکـەی ژمـارەی ٤٠ بـووە، لـە شـاری (ئەریـدو) پەرسـتگای هەبـوو، بابلییـەکان ناویـان لێنـا (ئەیـا)، بەخواوەنـدی (ژیـری) ناسـراوە.

لەبیروباوەڕەری مرۆڤی دێرین ئەم خواوەندە خێرخواز و دۆستی مرۆڤ بوو.

**کۆمەڵەی دووەم:**

**١-ننـار:** خواوەندی(مانـگ)، لـە شـاری (ئـوور) پەرسـتگای هەبـوو. هەروەهـا لـە شـارەکانی کوردسـتان وەکـو (حـەڕان) دەیـان پەرسـت. ئەکەدیـەکان پێیـان دەوت: (سـین).

**٢-ئۆتـۆ:** خواوەنـدی (رۆژی) سـۆمەریەکان بـوو ئەکەدییـەکان پێیـان دەوت: (شـمش) لـە دوو شـاری (سـپار) و (لارسـا) دەپەرسـت. بەخواوەنـدی هـەق و دادوەری ناسـراوە. بـە سـەرچاوەی (یاسـا) دانـراوە لـە وێنەکـەی لەمیلـی حەمورابـی دا کێشـراوە.

**٣-ئینانـا:** خواوەنـدی جوانی و جەنگ و دەسـەڵات بوو، بەڵام سـۆمەریەکان لەشـاری (وەرکا) دەیانپەرسـت، بابلییـەکان پێـی دەڵێـن: (عەشـتار) هەسـارەی سبەینان (زوهـرە) هێماکـەی بـوو.

## خواوەندە نەتەوەییەکان:

ڕۆڵی هەندێك لە خواوەندەکان گەشەی سەند بەهۆی فراوانبوونی دەسەڵاتی شار و ئەو نەتەوانە کە دەیان پەرستن وکاتێك پاشاکان کە پیرۆزییان لەو خواوەندانە دەنا، هەوڵی بڵاوکردنەوەی پەرستنیان لەشارەکانی تردا دەدا ئەمجۆرە خواوەندانە سیفەتی (نەتەوەییان) وەرگرت، لەجۆری ئەم خواوەندانە:

**١-مردۆخ:** خاوەندی شاری (بابل) و هێمای دەسەڵاتی بوو. لەسەردەمی حامورابی و دەوڵەتی (بابل) پەرستگاکەی پێی دەوترا(ئیساکلا)، ڕۆڵی پاڵەوانی لە داستانی خەڵقکردنی بابلیدا پێ بەخشراوە، هاوسەری خواوەندی (صربانیتم) بوو.

**٢-ئاشوور:** خواوەندی ئاشووریەکانە و هێمای دەسەڵاتداریانە، ڕۆڵی ئەم خواوەندە بەهۆی فراوانبوونی دەوڵەتی ئاشووری پەرەی سەند بووە هاوشانی خواوەندی ئەنلیل کە خواوەندی سۆمەریەکان بوو. لە شارەکانی (ئاشوورو کەلخو و خرسباد و نەینەوا) دەپەرسترا.

**٣-خواوەندی خالتی (خالدی):** خواوەندی دەوڵەتی ئۆرارتۆکان بوو، هەروەها خواوەندی (خالدیەکان)یش بووەکە لە ناوچەی (ڕواندوز) جێگیربوون. شا سەرجۆنی دووەم لە ساڵی ٧١٤ پ.ز پەلاماری خالدیەکانی داو پەرستگای خواوەندی (خالدی) تالان کرد و پەیکەرەکەی بۆ ولاتی ئاشوور گواستەوە.

## بنیاتنانی پەرستگا

شـوێنەواری کۆنترین پەرستگا لـە تەپەگـۆرا لـە ڕۆژهەڵاتـی نەینـەوا دۆزراوەتـەوەو سەردەمەکەیشـی دەگەڕێتـەوە بـۆ سـەردەمی شارسـتانێتی (حەلـەف) لـە دەوروبـەری سـاڵانی ٤٥٠٠-٤٠٠٠ پ.ز.

پەرسـتگا ناوەنـدی پەرسـتن و بەجێهێنانـی دروشـمە ئاینیـەکان و جێگـەی چالاکـی سیاسـی و ڕۆشنبیری و کارگێڕی و فێربوونـی خوێنـدن و نووسین و بـارەگای دادوەریـش بـووەو شـوێنی نیشـتەجێبوونی پیـاوی ئایینـی (کاهـن)ی فەرمانـڕەوا (EN) بـووە.

پەرستگا خاوەنـی زۆربـەی زەوییـە کشـتوکاڵییەکان بـوو بەنـاوی خواوەنـدەوە بەرهەمـی دەهێنـا یـان بەکرێـی دەدا، هەروەهـا خاوەنـی مێگـەڵ بوو بازرگانیشـی دەکـرد، هەندێـك لـە پاشـاو فەرمانـڕەواکان تەنهـا خەریکـی کاری کارگێـڕی یـان ئابـووری بـوون.

لەبـەر پیـرۆزی پەرسـتگا دانیشـتوانی دۆڵـی دووئـاوان بەتایبەتـی پاشـاو فەرمانـڕەواکان جەختیـان لەسـەر بنیاتنـان و خزمەتکردنـی کردبـۆوە، پەرسـتگا لەسـەر شـوێنێکی بـەرز یـان سـەکۆیەك دروسـتدەکرا تاوەکـو گەورەیـی و شـکۆمەندی دەربکـەوێ و لەگـەڵ پایـەی خواوەندەکانـدا بگونجـێ، دیوارەکانیشـیان بـە نەخـش و نیـگاری جـوان دەڕازانـدەوەو ڕەنگیـان دەکـرد، بـەڵام زیاتـر ڕەنگـی سپییان بەکاردەهێنا تالـە شـەودا بـە جوانـی بدرەوشـێتەوە، لەسـەرەتا پەرسـتگا تەنهـا ژوورێکـی لـە قـوڕ دروسـتکراو پێکهاتبـوو دەلاقەیەکـی تێـدا بـوو بـە (پەیکـەری) ناودەبـرا، چونکـە پەیکـەری خواوەنـد لـەوێ دادەنـرا، و گۆڕەپـان (پاوەن)ێکـی فـراوان لـە دەوری پەرسـتگا هەبـوو..

لـە ئەنجامـی پێشـکەوتنی ژیانـی ناوشـار و گەشەسـەندنی ڕۆڵـی پەرسـتگا لـە ژیانـی دانیشـتوان ڕووبـەری بینـای پەرسـتگا گـەورەو فراوانتـر بـوو، بـەڵام هەروەکـو نەخشـەی پێشـووی گۆشـەکانی ڕوویـان لەهـەر چـوارلا دەکـرد وەکەچـی لەنەخشـەی نوێیـدا پاشـکۆی زۆری زۆری بـۆ زیادکـرا کەبـۆ پەرسـتن مێژوونووسـی یۆنانـی (هیرۆدتـس) ئامـاژە بـە زەققـورەی بابـل دەکات نـاوی لێنـاوە (قوڵلـەی بابـل) ودەڵێـت: ئـەم قوڵلەیـە لـە حـەوت (نهـۆم) دروسـتکرابوو،

و كارگێڕی تەرخانكران، لەم نەخشە نوێیەیدا پەرستگا بە رۆژێك دەستی پێدەكرد ئەمیش دەچووە سەر پاوەنێكی بەرینی زەوی و لەوێشەوە دەگەیشتە ژووری(پەیكەر)ی خواوەند، ئەم ژوورە پیرۆزترین شوێنی پەرستگا بوو، و لەم ژوورەدا دەلاقەی پەیكەر هەبوو لەبەردەم دەلاقەكەشدا سەكۆی قوربانیكردنی هەبوو.

## زەقورە:

لە زمانی ئەكەدی وشەی (زەقورە) مانای (بینای بڵند) دەبەخشێ. بریتی بوو لە قولەیەكی زۆر بڵند، لە سێ تا حەوت چین پێكهاتبوو. لە چینێكەوە بۆ چینی سەرەوە، ڕووبەری سەروتر كەمتر دەبێت بنكەی زەقورە چوارگۆشە یان لاكێشە دەبوو، بەگشتی زەقورە بە پێپلیكانەی دەرەكی دەورە دەدرا.
زەقورە گرنگترین بەشەكانی پەرستگاكانی شار بوو. سەكۆكەكانی (زەقورە) لە خشتی وشكراو بە تیشكی ڕۆژ بنیات دەنرا، لەدەرەوە بە بەرگ لە كەرپووچی سوركراو بەرگردەكرا. ناوی پاشای بنیاتنەری لەسەر دەنووسرا. قەبارەی زەقورە لە شارێكەوە بۆ شارێكی تر جیاواز بوو. لەبەناوبانگترین زەقورەكان وەكو (زەقورەی بابل و زەقورەی ئوور).



پاشماوەی زەقورەی ئور

نهۆمی حەوتەم ژوورێکی بچووك بوو، بۆ پشوودانی خاوەند تەرخان کرابوو. زەققورەی (شاری ئوور) کە شا(ئوورنەمو) بنیاتی نابوو، تاکو ئێستا پاشماوەی زەققورەی (ئوور) لەسەر پێ ماوە، ڕووبەری بنکەکەی دەگاتە ٢٧٠٠م٢ شوێنەوارناسان بەرزیەکەی بە ١٣م مەزندە دەکەن. لە سێ نهۆم پێکهاتبوو، ئەم زەققورەیە بە جوانی و ڕێکی و پتەوی بناغەی ناوبانگە. ئەندازیارانی ئەم زەققورەیە بە شێوەیەکی ئەندازەیی گونجاو هەموو پێوەرەکانیان ڕێکخستبوو.

کاشیەکان لە (عەقرقوف) زەققورەیان بنیاتناوە، ئاسەواری تا ئێستا لەسەر پێیە، لەحەوت نهۆم پێکهاتبوو.. سۆمەریەکان لە شارەکانی وەرکا و ئەریدۆ و نەفەر زەققورەیان بنیاتناوە. شای ئاشووری سەرجۆنی دووەم لە شاری (خرسباد) زەققورەیان بنیاتناوە.

**(کاهینەکان):  ئەوانەن کە خزمەتی خواوەندەکان دەکەن، چاودێری پەرستگاکانیان دەکەن ئاهەنگە ئایینیەکان بەڕێوەدەبەن.**



زەققورەی عەقەرقوف

لەسەرەتادا لە وڵاتی سۆمەری هەردوو دەسەڵاتی دونیایی و ئایینی بەدەست پیاوە ئاینیەکان بوو، بەڵام پاشتر ئەم دوو دەسەڵاتە لێك جیابوونەوەو پیاوە ئاینیەکان تەنها دەسەڵاتی ئایینیا بوو. کاهینەکان خوێندن و نووسینیان زانیوە، بۆیە مامۆستاو نووسەر و دادوەرەکان هەر لەوان بوون. (کاهن) پایەی ئایینی و کۆمەڵایەتی بەڕێز و شکۆداری هەبوو.. بەهۆی زۆربوونی ئەرکەکانی (کاهینەکان) جۆرە پسپۆڕیەك لە کارەکانیان پەیدا بوو.. بۆیە یەکێکیان سەرپەرشتی کاروباری قوربانیکردنی دەکرد ئەوی تر نەخۆشەکانی چارەسەردەکرد، و سێیەمیان سەرپەرشتی ئاهەنگی ستران و سرووودەکانی دەکرد. گرنگترین جۆری (پیاوی ئایینی – کاهن) ئەمانە بوون:

**أ-ئاشیبو:** بەرپەرسی چارەسەری نەخۆشی و ڕاونانی گیانە شەڕنگێزەکان بوو.

**ب- مشمشۆ:** بەکاری بەخت خوێندنەوەو قاڵچێتی هەڵدەستێ، هەروەها سەرپەرشتی و خاوێن کردنەوەی پەرستگابوو بە ئاووزەیت.

**ج- نارو:** سەپەرشتی ڕێکخستنی خوێندنەوە لاواندنەوە ئایینیەکان دەکات.

**د- گالو:** ئامێرەکانی مۆسیقا ئامادە دەکات و مۆسیقا ئایینی دەژەنێت.

**ە- شیشکلو:** سەرپەرشتی هەموو دروشمە ئایینیەکان و ئاهەنگەکانی سەری ساڵ و نوێکردنەوەی پەیمان بۆ پاشای دەکرد.

هەروەها ئافرەتە کاهینەکان ڕۆڵی گرنگیان لەبەڕێوەبردنی کاروباری پەرستگاکان و خزمەتکردنی خواوەندەکان و پەیڕەوکردنی دروشمە ئایینیەکاندا هەبوو.

## ئاهەنگی سەری ساڵ (ئەکیتۆ): (Akitu)

ئـەم ئاهەنگـە بـە بیروبـاوەڕە ئایینیەکانـی دانیشـتوانی دۆڵـی دوو ئاوانـەوە بەنـدە. لەسـەرەتادا لەسـەردەمی سـۆمەریەکانەوە دەسـتی پێکـرد. پاشـتر لـە وڵاتانـی بابـل و ئاشـووریش بڵاوبـووەوە، بـەڵام زیاتـر لای بابلییـەکان بـاو بـووە ئـەم ئاهەنگـە هێمایـەك بـووە بـۆ سـەرەتای نوێبوونـەوەی ژیـان لەگەشـەکردن و سـەوزبوونی زەوی ودارو درەخـت و رووەك و ئـاژەڵ و پەلـەوەرو مێـروو، هەروەهـا هێمایەکیـش بـووە بـۆ گـوڵ و جوانـی.

ئاهەنگێـڕان لـە سـەرەتای مانگـی نیسـان پێدەکـردو ١٢ ڕۆژ دەخایەنـدو پێنـج ڕۆژی یەکەمـی تەرخـان دەکـرا بـۆ پاکبوونـەوە لـە تـاوان و نوێکردنـەوەی پەیمـان بـۆ پاشـاو هێشـتنەوەی پاشـا لەسـەر حوکـم بـۆ سـاڵێکی تـر.

لـە شـاری بابـل شـەقامی تایبـەت بـە تێپەڕبوونـی کاروانـی ئاهەنگەکـە هەبـوو نـاوی (شـەقامی کاروان)ی لێنرابـوو.



ئاهەنگی سەری ساڵ لە بابل

لـە دەرگای پەرسـتگای خواوەنـد عەشـتارەوە تـا دەرەوەی شـوورەی شـار درێـژ دەبـووەوە کـە پەرستگای تایبەتـی بـۆ ئاهەنگێڕانەکـەی لـێ بنیاتنـرا بـوو. پـاش کۆتایـی پێهاتنـی ڕێـڕەوی کاروان و گەیشـتنی کاروانەکـە بـە پەرسـتگای ئاهەنگەکـە پیـاوی ئایینـی ((کاهـن)) دروشـمەکانی پاشـای دەوتـەوە بەمـەش ئاهەنگەکـە دەگەیشـتە لوتکـە، و ئاهەنگەکـە کۆتایـی دەهـات. لـە ڕۆژی دواتـردا پەیکـەری خواوەندەکانیـان دەگەڕانـدەوە پەرسـتگاکان.

جێـی ئاماژەیـە ئـەم ئاهەنگـە جـۆرە ڕێکخسـتنێك بـوو لـە نێـوان پاشـاو کاهینەکانـدا بـۆ دابەشـکردنی دەسـەڵاتی ئایینـی و نیایـی لـە نێـوان خۆیانـدا. لەگـەڵ ئـەوەدا ئـەم ئاهەنگـە هێمایەکـی ئایینـی بووە ئامـاژەش بـووە و زۆربوون و وەرزی گەشـە، هێمـای نوێبوونـەوەی ژیانیـش بـووە.

شـایانی باسـە زۆربـەی جەژنەکانـی میللەتـان بەنـدە بـووە بـە دیـاردەی سروشـتی وەکـو گـۆڕانـی وەرزەکان و پێگەیشـتنی بەروبوومـەکان و وەرزی دروێنـەوە لەوانـەش ئاهەنگـی کـوردە ئێزدیـەکان و جەژنـی (الفصـح)ی فەلـەکان و جەژنـی نـەورۆزی کـوردان و نەتـەوە ئارییـەکان کـە لای کـورد بووەتـە جەژنـی نەتەوەیـی.

## سێیەم: نووسین و فێربوون:

سۆمەرییەکان وێنـەو هێمایـان بەکارهێنـاوە. ئـەم وێنـەو هێمایانـە کـە سـەرەتا لەسـەر تاتـە قـوڕ بـە پێنووسـێکی لـە قامیـش دروسـتکراوی نـووك سـێ گۆشـەیی دەنووسـران. تاتـە قـوڕەکان لـە کاتـی بەکارهێنـان تەڕبـوون پاشـتر پـاش وشـکبونەووەیان، وێنـەو هێمـاکان لـە وێنـەی (بزمـار) دەردەکەوتـن، بۆیـە ئـەم دەسـتخەتە پێـی دەوتـرا (نووسـینی بزمـاری(Cuneiform)، نووسـینی بزمـاری بـە سـێ قۆناغـدا تێپەڕبـووە ئەوانیـش:

## قۆناغی وێنەیی:

مرۆڤ وێنەیەکی بچووکی ئەو شتانەی دروست دەکرد کە گوزارشی لە هەست و دیتنەکەی دەکات. بۆ نمونە: ئەگەر چیای ببینابا وێنەی چیای دەکێشا.

( Kur ) ، ئەگەر ئاماژەی بە ماسی بکردایە وێنەکەی دەکێشا، بەم جۆرە نووسەر لەم قوناغەدا بە پلەی یەکەم گوزارشتی لە شتە مادیەکان دەکرد، بۆ ئەم مەبەستە پێنووسی نووك تیژی بەکاردەهێنا تەنها لە (وەرکا) پێنج هەزار تاتە قوڕ دۆزراوەنەتەوە.



تاتە قوڕێك کە نووسینی وێنەیی تیادا دەردەکەوێت

## قۆناغی هێما بەکارهاتن (Ideographic):

وێنەکان هەموو شتەکانیان دەرنەخست.. بەتایبەتی هزرو کردەوەکان. بۆیە مرۆڤ نیشانەو هێمای بەکارهێنا بۆ دەرخستنی هزرو کارەکانی، بۆیە لە نووسیندا ناو کارو خەسڵەتەکانیش هاتنە تۆمارکردن.

بۆیە وێنەکێشانی (ئەستێرە – هەسارە) تەنها ئاماژە بەخودی هەسارەکە نەبوو، بەڵکو ئاماژە بوو بە بڵندی، بە خواوەند، بەشتە بروسکەدارەکان وێنەکێشانی (پێ) ئاماژەبوو بۆ وەستان و ڕۆشتن و هەڵگرتن و ڕاکردن.

## قۆناغی دەنگی (بڕگەیی): (Phonetic)

لـەم قۆناغـەدا نیشـانەی وێنەیـی و هێمایـی بەهـۆی بەهـای وەکـو (دەنـگ) بەکارهاتـووە. بەبـێ گوێـدان بەمانـای وێنەیـی و هێمایەکـەی. نووسـین وەکـو پیتـە (ئەبجەدیـەکان)ی لێهـات، لەگـەڵ بوونـی جیـاوازی ئەویـش ئەوەیـە کـە پیـی (ئەبجەدییـەکان) دەنگـی تـاك بەرجەسـتە دەکات وەکـو پیتـی (م یـان د یـان ر)، هەرچـی بڕگـەی دەنگییـە ئـەوە دەنگـی کـپ دەنوێنێـت لەگـەڵ پیتێکـی بزوێـن پێـش یـان وەکـو (مـا، مـو، ئـم) یـان لـە دوو پیتـی کـپ پێـك دێـت لـە ناوەندیـان پیتـی بزوێـن هەبـوو وەکـو (نیـن – خاتـون Nin)، کـوڕ – چیـا - Kur ). نیشـانەو وێنەیـی و هێمایـەکان ڕەنگدانـەوەی زمانـی نووسـینەکە نەبـوون، چونکـە دەکـرێ ببێتـە گوزارشـتکردن لـە شـتەکان لەهـەر زمانێکـدا.

لـە قۆناغـی دەنگـدا، دەرکـەوت سـۆمەریەکان، وێنـە و نیشـانەیان لەگـەڵ بڕگـەی بەهـا دەنگییـەکان بەکارهێنـاوە بـۆ گوزارشـتکردن لـە زمانەکەیـان . بۆیـە زمانەکـەی خۆیـان لـە شـێوەی بڕگـەدا نووسـیوە، چونکـە زمانـی سـۆمەری لـە زمانـە لکێنـراوە (لغـە لصقیـە).

دوو بڕگە یان زیاتر پێکەوە دەلکێنرا بۆ ئەوەی مانایەکی نوێ ببەخشێت.

بۆ نموونە وشەی ئن + لێڵ = مانای(گەورەیان خواوەندی هەوا) دەبەخشێت.

هەروەها وشەی ئی = کۆشك و وشەی گال = مەزن

پێکـەوە بەکارهێنانـی ئـی + گال = مانـای: کۆشـکی مـەزن دەبەخشـێت. وشـەی ئـن = گـەورەو وشـەی کـی = زەوی

پێکەوە گرێدانی ئن + کی = مانای (خواوەندی زەوی) دەبەخشێت.

نووسـین بەدەسـتی ئەکەدیـەکان و بابلییـەکان و ئاشـوورییەکان گەشەسـەندنی بەخـۆوە بینـی.. ئـەوان خەتـی بزماریان لـە سـۆمەریەکان وەرگرت، نیشـانەکانیان کورتکـردەوە، زمانـی خۆیـان پـێ تۆمارکـرد، ژمـارەی نیشـانەکان ١٨٠٠ نیشـانەبوو، ئاشـوورییەکان کورتیـان کـردەوە بـۆ ٢٠٠ نیشـانە.

بەهـۆی بەکارهێنانـی نووسـینی سـۆمەری لـە لایـەن نەتەوەکانـی تـرەوە، ئاسـەواری زمانـی سـۆمەری لـە زمانـی ئـەو نەتەوانـە دیارکـەوت.

## قوتابخانەکان:

لە دۆڵی ڕافیدەین هیچ جۆرە قوتابخانەیەك بە چەمکی هاوچەرخ نەبوو، بەڵام جێگەی فێرکردنی خوێندن و نووسین و ژمێریاری هەبووە.

لە پەرستگاکان، باڵێکی بیناکە بۆ فێرکردنی تەرخان دەکرا مامۆستاکان یەکەمین جار (کاهن)وکان بوون، یەکەمین فێرخوازانیش منداڵانی کاهینەکان بوون، هەروەها پاشان باڵێکی کۆشکەکانیان بۆ فێرکردنی منداڵەکانیان تەرخان دەکرد.

قوتابخانە لە زمانی سۆمەریدا ناوی (ماڵی تاتەکان – E.D.UBA) لێنراوە، چونکە فێربوون بە ئامادەکردنی تاتە قوڕینەکان دەستی پێکرد کە پێی دەوترا (تاتەکانی قوتابخانە) لەبەر ئەوەی قوتابخانە لەهەمان کاتدا پەرتووکخانەش بوو، بۆیە زاراوەی (E.D.UBA) بۆ کتێبخانەش بەکارهاتووە.

فێربوون لە تەمەنی ٧ ساڵی دەستی پێدەکرد، سەرەتا قوتابی فێری (خوێندن و نووسین) دەبوو. پاشتر بەرەو قۆناغێکی بڵندتر دەبوو، چەرخناسی و پزیشکی و ماتماتیکی دەخوێند.

قوتابخانە لە زمانی ئەکەدی ناوی (خانووی مەمو واتا خانووی دانایی Betmamu) لێنرا.

مامۆستای بەڕێوەبەر، پێیان دەوت، باوکی قوتابخانە، مامۆستای وانەکان بە برا گەورە ناسراوە، گرنگترین ئەرکەکانی نووسینی تاتە قوڕەکان بوو بۆ خوێندکاران و داواشی لێ دەکردن بینووسنەوە، هەروەها نووسینی خوێندکارانی دەپشکنی و گوێی لێ دەگرتن.

پاشتریش پسپۆری لە قوتابخانە پەیدابوو، مامۆستای نیگارکێشان لە مامۆستای زمان جیاکرایەوەو مامۆستایەکی تریش بەدواداچوونی هاتنی قوتابیان دەکردو لە ڕێك وپێکی دەوامیانی دەپرسیەوە.

## کتێبخانە:

پاشاو کاهنەکان (پیاوە ئایینیەکان) بایەخیان بە کۆکردنەوەی دەقە بزماریەکان داوە بەتایبەتی دەقە ئاینی و ئەدەبیەکان ڕێکیان خستووەو لەشوێنی دیارکراودا دایاننــاوە.. بەم شێوەیە (کتێبخانە) پەیدا بوو. کتێبخانەی پاشایانە لە (نوفەر) و (وەرکا) و (کیش) و (بابل) و نەمرود (کەلخو) دۆزرایەوە.

پاشای ئاشووری (ئاشوربانیبال) ٦٦٨ – ٦٢٦ پ.ز تاتە قوڕەکانی لە هەموو شارەکانی عێراق کۆکردۆتەوە، کتێبخانەیەکی لە کۆشکەکەی داناوە. زیاتر لە بیست هەزار تابلۆی بزماری تێدابوو، کەسێك هەبوو بۆ ڕێکخستنی تاتە قوڕەکان ناوی (ئەمینداری تاتەکان(کتێبخانە)ی لێنراوە، تاتە قوڕەکان لەناو زەنبیلی قامیش یان سەندوقی تەختە یان گۆزەی سوورکراوە دەپارێزرا. بە تەنیشتیەوە تابلۆیەکی بچووك (ناسنامە) بۆ ناساندنی تاتەکان و ناوەڕۆکەکانیان هەڵدەواسرا.

## دەقە بزمارییەکان:

لە دۆڵی دووئاوان، نزیکەی دوو ملیۆن دەقی بزماری دۆزراونەتەوە. دەقەکان چەندین لایەنی ئابووری و ئایینی و ئەدەبی و یاسایی و کارگێڕی و ژمێریاری و چەرخناسی و دەقی بەخت ناسین و هەسارەناسی و پەندو دەقی تریان گرتوەتە خۆ. لەوانە:

### أ- ئەدەب (وێژە):

دەقە ئەدەبیەکان بە بەراورد لەگەڵ دەقەکانیتر کەمترن. دەقە ئەدەبیەکان داستان و ئەفسانەیان تێدایە.. ئەم دەقانە درێژ بوون، لەسەر زیاتر لە لەوحێك یان تابلۆیەکی قوڕ نووسراون. بەناوبانگترین دەقە ئەدەبیەکان وەکو داستانی (خولقاندنی بابلی – الخليقه البابليه) کە باس لە جیهانی

خواوەنـدەكان و دامەزراندنـی گـەردوون و خەڵقـی ئینسـان دەكات، بە شـێوازی شـیعر لەسـەر حـەوت قـوڕ نووسـراوە، لـە كتێبخانـەی (نەینـەوا) دۆزرایـەوە.
هەروەهـا وەك (داسـتانی گەلگامیـش) كـە بـاس لـە مـرۆڤ دەكات، سـیفەتی لـە مـرۆڤ بـەدەری دەخاتـە پـاڵ، بەشـێوازی شـیعر لەسـەر ١٢ تابلـۆی قـوڕ نووسـراوە.
ئـەم داسـتانە باسـی (گەلگامیـش) پاشـای وەركا و برادەرەكـەی (ئەنكیـدو)و پاڵەوانەتییـان دەكان.. بـاس لـە نەخۆشـكەوتن و مردنـی (ئەنكیـدو) و نیگـەران بوونـی گەلگامیـش بـەم ڕووداوەوە و هەوڵەكانـی بـۆ ڕزگاركردنـی لـە (مـردن) دەكات، بـەڵام بەبـێ هـوودە بـوو.
لـەم داسـتانەدا سـۆزی مرۆڤایەتـی لەنموونـەی دۆسـتایەتی و وەفـاداری دەردەخـات. و نەمـری مـرۆڤ لـە بەرخـودان و خزمەتكردنـی میللەتـدا دەنوێنێـت. واتـا نەمـری مـرۆڤ لـە كارە خزمەتگوزاریەكانیـدا.
جگـە لـە دەقەكانـی سـەرەوە، دەقـی ئەدەبـی لەشـێوەی ئەدەبـی ژیـری و پەنـد و ئامـۆژگاری بەرچاودەكەوێت، لـەو دەقانـە:
((میللەتی بێ پاشا وەكو مێگەلی بێ شوان وایە))
((گوێڕایەڵی دایكت بە هەروەكو چۆن فەرمانی خودا بەجێ دەهێنێت)).
چەندیـن دەقـی تـر هەیـە، كـە دادوەری خواوەنـد پیشـان دەدات وەكو داسـتانی (ئەیوبـی بابلی).

## ب- یـاسـاكان:

بـۆ ڕێكخسـتنی ژیانـی كۆمـەڵ و ، چارەسـەكردنی گرفتەكانـی هاووڵاتـی و، دەسـت نیشـانكردنی ئـەرك و مافەكانـی و نەهێشـتنی دەسـتدرێژی، پاشـاو حوكمڕانـەكان لـە دۆڵـی ڕافیدەیـن ڕاهاتبـوون چاكسـازی و یاسـا دارێـژن.
پێشـەكی یاسـاكان ئامـاژە بـە شـكۆمەندی خواوەنـدەكان دەكات، پاشـا كـە یاسـا دادەڕێژێـت، ئـارەزووی خواوەنـدەكان بەجـێ دەهێنێـت، بەمەبەسـتی بڵاوكردنـەوەی دادوەری و خۆشـگوزەرانی بـۆ دانیشـتوان.
هەرچـی كۆتایـی یاسـاكانە، ئـەوە باسـی لـە دەسـكەوتەكانی پاشـایان دانـەری

یاساکان دەکرد لەگەڵ بانگەواز کردن بۆ پاراستن و لانەبردنی یاساکە، هەروەها هەڕەشەیشی لەو کەسانە دەکرد کەدەستکاری یاساکان دەکەن بەوەی کە خواوەندەکان بەڵایان بەسەردا دەبارێنێ.
میری بنەماڵەی لەگشتی سۆمەری ئورونمیکینا (ئورکاجینا) یەکەمین جاڕنامەی چاکسازی کۆمەلایەتی لە دەوروبەری ساڵی ٢٤٠٠ پ.ز بڵاوکردەوە.
بەمەبەستی نەهێشتنی دەستدرێژی بۆ سەر بێ دەسەڵات و هەژارەکان، هەروەها باجی کەمکردەوەن مافەکانی بۆ مافە پێشێلکراوەکان گەڕاندەوەو ئازادی بەخشی.
لەو یاسانە کە بەدەست توێژەرەوەکان گەیشتووە:

## ١- یاسای ئورنەمو ٢١١٣ – ٢٠٩٦ پ.ز:

کۆنترین یاسای کە تاکو ئێستا دۆزراوە. ئەم یاسایە بە زمانی سۆمەری تۆمارکراوە، ٣١ بەندی یاسایی تێدایە. لەگەڵ کۆتاییەك، هەندێك لە بەندەکان ناخوێندرێنەوە، چونکە ڕزیون، ئەم یاسایە بنەمای پێبژاردنی بۆ سزادان بەکارهێناوە، ئەمەش بەڵگەی شارستانییەتی کۆمەڵی سۆمەرییە – ئەمەش لە بەندی ١٥ دا هاتووە:
(( ئەگەر پیاوێك پێی کەسێکی تری بڕی ئەوە لەسەریەتی ١٠ شیقلی زیو بداتە زەرەر لێکەوتووەکە)).

## ٢- یاسای (لبت عەشتار): ١٩٣٤ – ١٩٢٤ پ.ز:

پێنجەمین پاشای بنەماڵەی (ئیسن)ە . یاساکەی بە زمانی سۆمەری داناوە.
مەزندە دەکرێت ئەم یاسە ١٠٠ بەندی گرنبێتەخۆ، بەڵام تەنها ٣٧ بەندە گەیشتوەتە دەستی توێژینەرەوەکان.
بەندەکان لە بەندەکانی یاسای (ئورنەمو) دەچێت، چونکە سەرەتای (بژاردن) لێرەشدا هەیە.

## ٣- یاسای ئەشنۆنە:

دەگەڕێتەوە مەملەکاتی ئەشنونە لە دەڤەری (دیالی). کۆپیەکی ئەم یاسایە لە گردی (حەرمەل) لە نزیکی (بەغداد جدیدە) دۆزرایەوە.پێشەکیەکەی بە زمانی سۆمەری نووسراوە، هەرچی ٦٠ بەندی یاساکەیە، ئەوە بەزمانی ئەکەدی نووسراوە. کاریگەری شارستانییەتی سۆمەری زۆر بەڕوونی لەم یاسایەدا دیارە. دیسان سەرەتای (بژاردن – التعویض) لێرەشدا هاتووە.

## ٤- یاسای حامورابی: ١٧٩٢ – ١٧٥٠ پ.ز

ڕێکترین و پێشکەوتووترین یاسای دۆزراوەی ئەم سەردەمانەیە. ئەم یاسایە لەسەر میلێك لە بەردی (دیورایت)ی ڕەش، تۆمارکراوە. لەشاری (سوسە) پایتەختی ولاَتی (ئیلام) (دەڤەری ئەهواز) لە ١٩٠١ ز دۆزراوەتەوە.



میلەکەی حامۆرابی

وادیارە ئیلامییەکان پاش پەلاماردانی (بابل) وەکو تالاَنی لەگەڵ خۆیان بردویانەتە ئەوێ. بەرزی میلەکە ٢٢٥سم، تیرەکەی ٦٠ سم لە سەرووی میلەکە، وێنەی خواوەندی رۆژ کێشراوە لەسەر کورسی خۆی دانیشتووە، حەمورابی بەرامبەری کڕنۆش دەبات. ئەم میلە ٤٤ بڕگەی نووسینی بە زمانی ئەکەدی تێدایە. پێشەکی بە شێوازێکی ئەدەبی شیعر ئامێز نووسراوە. کۆتاییەکەی بە شێوازێکی نزیکتر لە زمانی یاسا نووسراوەتەوە. بەندەکان کە ژمارەیان ٢٨٢ بەندە، هەموو مەسەلە کۆمەلاَیەتی و ئابووری و سەربازیان چارەسەرکردووە.

**دەکرێت یاسای حامورابی بەم شێوەیە پۆلین بکرێت:**

**بەشی یەکەم: دادوەری (بەندی ١ – ٥)**

**بەشی دووەم: ماڵ و موڵك (بەندی ٦ – ١٢٦)**

**بەشی سێیەم: باری کەسی (بەندی ١٢٧ – ٢١٤)**

**بەشی چوارەم: کرێ (بەندی ٢١٥ – ٢٧٧)**

**بەشی پێنجەم: کۆیلە (بەندی ٢٧٧ – ٢٨٢)**

وێڕای زۆری بەندەکانی ئەم یاسایە، هەندێك کێشەی گرنگ هەیە باسی نەکردون وەکو کوشتنی قەستی و ڕفاندنی هاووڵاتیان و خیانەت لە نیشتمان، پێدەچێ ئەمانەی بۆ نەریت و یاسای باوی ئەو کاتە جێهێشتبێ. لەم یاسایەدا بنەمای (سزادان) بە ڕوونی دیارە بە پێچەوانەی بنەمای (بۆ بژاردن) ەوە هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ باڵا. دەستی (ئاموری)ە دەشتەکیەکان بەسەر عێراق و کۆتایی هاتنی دەسەڵاتی سۆمەریەکان بۆیە بە زەبری هێز یاساکانیشیان چەسپاندووە، هەروەها لەبەر زۆری ژمارەی دانیشتوان و بڵاوی پێشێلکردنی مافی کەسانی تر ڕێو شوێنی سەرکوتکارانەیان گرتۆتە بەر هەروەك چۆن لە یاساکەشدا ڕەنگی داوەتەوە. ئەمەش نموونەیەکیی ئەم یاسایەیە بەندی (٦) دەڵێت:

(( ئەگەر کەسێك شتێکی لە خواوەندیان لە کۆشك دزی، ئەو کەسە لە سێدارە دەدرێت، هەروەها ئەو کەسەش کە شتەکە پێ دەگیرێت، لە سێدارە دەدرێت)).

## چوارەم: ژیانی کۆمەڵایەتی:

گەڕان بەدوای ژیانی کۆمەڵایەتی کارێکی بەپێزە، بۆ زانینی پەیوەندییەکانی نێوان دانیشتوان و گرفتەکانیان و ئاستی ژیانی ڕۆژانەو گوزەرانیان و ئاستی رۆشنبیریان، و ئاشنابوون لەگەڵ داب و نەریتیان و دیاریکردنی چینەکۆمەڵایەتییەکان و زمان و سروشتی نیشتەجێبوونیان:

### أ- چینە کۆمەڵایەتییەکان:

کۆمەڵگەی دۆڵی دووئاوان لە دوو چینی سەرەکی پێکهاتبوو، ئازادەکات و کۆیلەکان، بەگوێرەی یاساو نەریتەکانی ئەو سەردەمە، ئەندامانی چینی (ئازادەکات) هەموو وەکو یەك نەبوون ، چونکە ئازادی هەندێکیان سنووردار بوو، چینی گشتی کە زۆرینەی دانیشتوانیان پێك دەهێنا، زۆربەیان هەژاربوون، ئازادیان لە ئازادی چینی حوکمرانی دەوڵەمەندەکان کەمتر بوو.. ئەو توێژە بەپێی یاسای حامورابی لە کۆمەڵگە پێیان دەوترا (هەژارەکان – موشکینم) چینی دەست ڕۆیشتووەکان پێیان دەوترا (چینی یەکەم – ئویلم).

لە ڕووی عەمەلیەوە کۆمەڵگە لەم توێژانە پێکهاتبوو:

**١- خێزانی پاشا:** پاشاو منداڵەکانی و ژنەکانی دەگرتەوە. پایەیەکی ئایینی و کۆمەڵایەتی بڵندی هەبوو، لە کۆشکی ڕازاوە دەژیان، کە هەموو هۆکارەکانی گوزەرانی تێدابوو. ژمارەیەکی زۆر لە بەردەست و کۆیلە خزمەتیان دەکرد.

**٢- چینی دەسەڵاتدار:** میرو بەگزادەکانی بنەماڵەی پاشاو نەجیب زادەکان دەگرێتەوە. لەگەڵ خاوەنی زەویە بەرینەکان و سەرکردەکانی سوپاو فەرماندەرانی هەرێمەکان و پیاوە ئایینییەکان و گەورە بازرگانان.

**٣- دادوەرو پزیشکان و نووسەرەکان و مامۆستایان و خاوەن پیشەکان..** خۆشگوزەران و ژیانی باشیان بردووتە سەر.

**٤-چینی گشتی:** بازرگانە بچووکەکان و خاوەن پیشەکان و کارمەندانی کێڵگەو ڕەزەکان دەگرێتەوە. ئەم خەڵکانە لە خانووی بچووکدا گوزەرانیان دکرد و بە کاری ڕۆژانە بژیویان دابین دەکرد. زۆرجار ئەم جۆرە کەسانە دەکەوتنە ژێر ڕکێفی قەرزاریەوە بەتایبەتی لەکاتی قەیرانە ئابوورییەکان، ناچاردەبوون کوڕان و کچانیان بفرۆشن یان ئازادییان لەدەست بدەن و دەبوونە کۆیلە.

**٥- کۆیلەکان:** پیاوان و ژنان دەگرێتەوە، ئەوانەی کە لە شەڕەکاندا بەدیل دەگیران یان ئازادی خۆیان بەهۆی هەژاری لەدەستت دەدا. هەروەها منداڵە غەیرە شەرعییەکان دەبوونە کۆیلە، منداڵە کۆیلەکان سەرچاوەیەکی تری چینی کۆیلە بوون.

کۆیلە بە موڵکی ئاغاکەی دادەنرا، نیشانەی کۆیلەیی لە دەست یان لە لەشی دەدرا، ئاغاکەی بۆی هەبوو بیفرۆشێ یان، بە خەڵات بیدا بەم و ئەم، وێڕای ئەوەش کۆیلە هەندێك مافی هەبوو وەکو ژنهێنان و خاوەنداری.. یاساکان سزای ئەو کەسانەیان دەدا کە دەستدرێژیان بەسەر کۆیلەکان دەکرد.

## ب- خێزان:

**خێزان لەسەر بنەمای داب و نەریت و یاساکانی باوی ئەو سەردەمە دادەمەزرا.**

هەنگاوی یەکەم بە هەڵبژاردنی هاوسەر لە لایەن کوڕەوە دەستی پێدەکرد، کە برادەرەکانی بۆ ئەم مەبەستە دەکردە ناوەند یان لە ڕێگەی باوك و دایکەوە. پاشتر داوادەکرا، پاش ڕەزامەندی کەسوکاری کچ، دیاری پێشکەش بە بووك دەکرا، ئاهەنگیان دەگێرا وەکو ڕشتنی گوڵاو ڕۆنی زەیت بەسەر بوکدا، جار وابوو بەهۆی ناکۆکی نێوان کەسوکاری بوك و زاوا، مارەیەکە هەڵدەوەشێنرایەوە. ژنهێنان لە تەمەنێکی منداڵیدا دەستی پێدەکرد.. پاش کۆتایی پێهاتنی داواکاری، ئاهەنگەکانی مارەبڕین دەستی پێدەکرد، و ژن هێنانەکە مۆرکی یاسایی دەگرتەخۆ.

پیاو بە گەورەی خێزان دادەنرا و پێویست خێزانەکەی بژێنێ و خاوەنی دەسەڵاتی یەکەمی هەبوو لەناو خێزاندا، فرەژنی باوبوو، واتا پیاو زیاتر لە ژنێکی دەهێنا، لە یاسای حەمورابی هاتووە، پیاو تەنها لە حاڵەتی نەزۆکی ژنەکەی یان نەخۆشییەکی بەردەوام بۆی هەبوو ژنی دووەم بهێنێت.
ژن بۆی هەبوو داوای جیابوونەوە (تەلاق) لە مێردەکەی بکات ئەگەر پیاوەکە کارێکی ناوبانگ خراپی ئەنجام بدایە بۆ ناوزڕاندنی خۆی یا ژنەکەی.

## پێنجەم: ژیانی ئابووری

### أ - کشتوکاڵ:

لە دۆڵی دووئاوان زەوی و بەپیت زۆربوو بەتایبەتی دەشتە بەپیتەکانی باشوور. گرفتی سەرەکی کە دووچاری هاوولاتیان دەبوو، کەمی ڕێژەی باران بوو، بەرادەیەك کە بەشی ئاودێری بەرووبوومی کشتوکاڵی نەدەکرد. بۆیە هەڵکەندنی جۆگە و ڕاکێشانی ئاو لە دیجلە و دیجلەو فورات دەبێتە سەرچاوەی ئاودێری.
باری ئاووهەوا بۆ چاندنی چەندین جۆری بەروبووم و درەخت گونجاو بوو، بۆیە کشتوکاڵ هەر لە سەردەمی زووەکانەوە بووە بڕبڕی ژیانی ئابووری.
شوانکاری بە کشتوکاڵ گرێدەدرێت، دانیشتوان مەڕو بزن و ڕەشەوڵاخ بەخێوەکەن. کەڵکیان لە ڕەشەوڵاخ وەرگرت بۆ کێلانی کێڵگەکان و ڕاکێشتنی گالیسکەکان. گرنگترین بەروبوومیان گەنم و جۆ و نیسك و گەنمەشامی و پاقلە بوو. هەروەها کونجی و هەرزنیان چاندوە، جگە لە داری خۆخ و هەنار و هەنجیرو دارخورما، لۆکەو رووەکی جوانکاریان چاندووە.

- **ئاودێری:**

دانیشـتوانی دۆڵـی ڕافیدەیـن سیسـتەمێکی کاریگەریـان بـۆ ئاودێـری بنیاتنـا. لـە چوارچێـوەی دروسـتکردنی تۆڕێکـی ڕێکخـراو لـە جۆگـەو بەربەسـت و بەنـداو. بەربەسـتەکانیان بەهێزتـر کـرد بـە مەبەسـتی کەمکردنـەوەی مەترسـی لافـاو و گەیاندنـی ئـاو بـۆ جۆگـە سـەرەکیەکانی ئاودێـری. بەرزبوونـی ئـاو لـە هەندێـك شـوێندا دەبێتـە مایـەی پەیدابوونـی زەوی بـەراو لـەو دەڤەرانـە.

پاشـاو فەرمانڕەواکان بایەخیـان بـە بنیاتنانـی بەربەسـت و بەنـداو داوە، لـە بەندەکانی یاسـای ئـەو سـەرمەدا ئامـاژە بـەم مەبەسـتە دەدرێـت، وەکـو باسـکردنی کێشـەکانی ئاودێـری چۆنیەتی چارەسـەرکردنیان.

- **خاوەنداری زەوییە کشتوکاڵییەکان:**

زۆربـەی زەوی کشـتوکاڵییەکان موڵکـی پەرسـتگا بـوون، لـە سـەردەمی سـۆمەریدا. پەرسـتگا ئـەم زەویانـەی داوەتـە خەڵکانـی تـر بەرامبـەر هەندێـك خزمەتگـوزاری کەبـە پەرسـتگایان دەبەخشـی. یـان دەدرا بـە جوتیـارەکان بەرامبـەر ڕێژەیەکـی دیاریکـراو لـە بەرهەمەکانیـان، یـان ڕاسـتەخۆ لەلایـەن کارگێـڕی پەرسـتگاکانەوە بەرهـەم دەهێنـرا.

- **گرفتەکانی کشتوکاڵکردن:**

کشـتوکاڵ لـە وڵاتـی ڕافیدەیـن، دووچـاری هەندێـك گرفـت بـوو، لەوانـەش بەرزبوونـی ڕێـژەی خـوێ لـە زەویـەکان، بەهـۆی نەزانینـی، چۆنیەتـی دەرکردنـی زێدەئـاوەکان و، دژواری کۆنترۆڵکردنـی لافـاوەکان.

هەندێـك سـاڵ کشـتوکاڵ دووچـاری کـەم ئـاوی دەبـوو بەهـۆی نزمبوونـی ئاسـتی ئـاوی ڕووبـارەکان. هەندێـك ئافـات دەبنـە مایـەی کەمـی بەرهەمـداری، وەکـو سـن و کیسـەڵەو نەخۆشـی رووەکـی، یـان لـە کاتـی پێگەیشـتنی بەروبوومـدا دووچـاری پەلامـارو هێرشکردنەسـەریان دەبوونـەوە.

هەروەها سـاکاری کەرەستەکانی کشـتوکاڵ وەکو داس و گاسـن.. لە هۆکارەکانی گرفـت دروسـتکردن بـوون لـەم بـوارەدا، ئەمـەش پێویسـتی بـە هـەوڵ کاتـی زیاتـر هەبـوو، بـۆ ئـەوەی جوتیـار زۆربـەی رۆژانـی سـاڵ پەیوەسـت بـێ بـە بەکێڵگەکەیـەوە.

## ب – بازرگانی:

پێشکەوتنی کشتوکاڵ دەبێتە مایەی پەیدابوونی بازرگانی. کاتێك زێدە بەرهەم پەیدابوو، مرۆڤ هەوڵیداوە ئەم زێدەیە بیفرۆشێت یان بە بەرهەمێکیتر ئاڵوگۆڕی بکات وەك کەرەسەی کشتوکاڵییەکان، ئەمەش یاریدەی ئەوەی دا کە هەندێك پسپۆڕیەتی لە پیشەسازی کەرەسەی کشتوکاڵییەکان و کەلوپەلی ناوماڵ پەیدابکەن کە بووە مایەی پەیدابوونی دابەشبوونی کارو گەشەسەندنی پرۆسەی ئاڵوگۆڕی خۆی لە خۆیدا ئەمەش سەرەتای بازرگانی بوو.بازرگانی دوو جۆرە ئەوانیش:

- **بازرگانی ناوخۆ:** مەبەست لەو ئاڵوگۆڕە بازرگانییە کە لەنێوان دانیشتوانی دۆڵی ڕافیدەین ئەنجامدەدرا.

- **بازرگانی دەرەکی:** مانای گواستنەوەی شمەك و کارگوزاری بۆ دەرەوەی سنووری دۆڵی ڕافیدەین دەبەخشێت، وەکو بۆ سووریاو ئێران و ئەنەدۆڵ و ئاسیای بچووك.

بازرگانی دەرەکی ئاسەواری زۆر لە چالاکی ئابووری بەجێ دێڵێت. هەروەها یارمەتی گواستنەوەی دیاردە شارستانیەکانی لە دۆڵی رافیدەینەوە بۆ وڵاتانی دراوسێی داوە.

دانیشتوانی دۆڵی ڕافیدەین، پەیوەندی بازرگانیان بە سووریاو ئێران و ئاسیای بچووك و ناوچەی کەنداو هەبووە. لەو دەڤەرانەوە تەختە و کانزاو بەردی بەنرخیان هێناوە، دانەوێڵە و خوری و ئامێری کشتوکاڵیان بۆ ڕەوانە کردووە. (دراو – پارە) نەدۆزرابووەوە، بۆیە (جۆ) بۆتە هۆکاری ئاڵوگۆڕ، پاشان (زیو) بۆ ئەم مەبەستە بەکارهاتووە.

بەهۆی بازرگانییەوە زاراوەی (شیقڵ) کە یەکەیەکی کێشانە بوو وکێش و کێشانە و قەبان و تەرازوو پەیدا بوو. زاراوەی (کۆر)ی ئەکەدیان بۆ یەکەی (کێشان) بەکارهێناوە. پاشاو حمەکان ڕۆڵی گرنگیان لە چەسپاندنی کێشەکان و تەرازووەکان هەبوو.

هەرچی نرخەکانە، چەسپاو نەبوون، بەڵکو بەگوێرەی بارودۆخی بازاڕ دەگۆڕا، بە پێی داواکاری لەسەری و کاتی وشکەساڵی و شەڕەوە دەگۆڕا.

## شەشەم: زانست و زانیاریەکان:

دانیشتوانی دۆڵی دووئاوان، یەکەمین بنەماکانی زانیستیان داناوە. ململانەی مرۆڤ کە لەگەڵ سروشت زۆر دژوار بوو، بەڵام مرۆڤ لەم ململانێیە، بەهێز و سەرکەوتوو دەرکەوت. چەندین زانستیان دۆزیەوە و کاریان پێ کرد لەوانەش:

### أ: بیرکاری:

بیرکاری زانیاریەکی ئەزموونی و پراکتیزەکاری دادەنرێت، ژمێریاری و جەبر و ئەندازەیان گرتۆتە خۆ. ئەم زانستە بەلای عێراقیەکانەوە نەشو نما دەکات، چونکە پێویستیان پێ بوو بۆ بنیاتنانی زەقورە و بەربەست، هەوڵیان داوە ئەندازەو جەبر پێکەوە بەکاربێنن بۆ دامەزراندنی ئەم پرۆژانە. ژمارەیان زانیوەو لە ژمێرراو جیایان کردووە، بەم شێوەیە زانستی ژمێری پەیدابوو. جیاوازی لە نێوان ژمارە یەك و ژمارە (١٠) دە لە گەورەیی قەبارەی ژمارە (١٠) دەردەکەوێت، سۆمەریەکان سیستەمی سەدیان نەزانیوە.




### ب: گەردووناسی (فەلەك): Astroromy

ئەمەش زانستی چاودێریکردنی هەسارەکانە، چۆنیەتی بزاڤ و سووڕانەوەیان، پەیوەندی پتەوی بە بیرکاریەوە هەیە.

دانیشتوانی دۆڵی دووئاوان بایەخیان بە زانستی فەلەك داوە بۆ زانینی وەرزەکان و کات لە میانەی چاودێری جولەی هەسارە و ئەستێرەکان و، چەسپاندی کاتی دەرکەوتنی و کاتی بزربوونیان. سۆمەرییەکان ناویان بۆ زۆربەی هەسارەکان داناوە، بورجەکانیان ناسیوە. لەسەردەمی کاشییەکان ئەم زانستە پەرەی سەند، بابلییەکان لەدیاردە فەلەکییەکانیان کۆڵیوەتەوە، هەموو مەسەلە ژمێرياریيەکانیان لەسەر بنەمای ماتماتیك داناوە. هەردوو

دیاردەی ڕۆژگیران و مانگگیرانیان زانیوە، ڕۆژانی سالآی و درێژی شەو و ڕۆژ و خشتەی فەلەکیان ڕێکخستوە. سەربانی (زەقورەیان) بۆ مەبەستی چاودێری هەسارەکان بەکارهێناوە. تۆمارە بزمارییەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە لە وەرکا و بابل و سپار و ئەربائیلۆ(هەولێر) بازگەی چاودێری هەبووە. دانیشتوانی دۆڵی دووئاوان دەسکەوتی گەورەیان لەو بوارەدا بەدەست هێناوە. (ڕۆژ) یان بە ناوەندی گەردوون ناسیوە، ئاسمانیان بەسەر ١٢ بورجدا دابەش کردووە، هەر بورجێکیان بۆ یەك مانگ داناوە و زۆر بەوردی بزاوتی مانگیان دیاریکردووەو (وەرزی بە هار ) یان زانیوە.

## ج: پزیشکی :

پیشەی پزیشکی بە پیاوە ئایینییەکان گرێدرابوو. هەندێك باوەڕیان وابووکە هۆی نەخۆشی تووڕەبوونی خواوەندە لە مرۆڤ ، بۆیە خواوەند دێو و درنج دەنێرێتە جەستەی مرۆڤ و نەخۆشی دەکات، چونکە سەرپێچی فەرمانەکانی خواوەندیان کردووە .
هەندێ جاریش نەخۆشییان خستۆتە پالآ (سیحری ڕەش) ەوە، بۆیە یاساکان بە توندی سزای ئەو کەسانەیان داوە کە ئەم جۆرە سیحرەیان ئەنجامداوە. هەندێك باوەڕیان وابوو کە ژینگە ڕۆڵی لە نەخۆشی بوون هەیە، (پەتا) و ئەگەری بلآوبوونەوەی نەخۆشی لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی تر یان زانیوە، هەندێك جار پەنایان بۆ کاهینەکان (کاهن) بردووە بۆ چارەسەری نەخۆشییەکانیان . هەتا (کاهن) گیانە شەڕخوازەکان لە جەستەی مرۆڤ دەربکەن، ئەو کاهینە کە ئەو کارەی ئەنجام دەدا پێیان دەووت ئاشیپو (asipo)، بەمەبەستی ڕاونانی گیانی شەڕخوازی دێوودرنج (دوعا) و(نوشتە) ی بۆ نەخۆشەکان دەنووسی لە ملیان دەنا ، و قوربانی و خەلآتیش بۆ چاککردنی نەخۆشەکان پێشکەش کردووە.
کاهینکی تر هەبووە دەیزانی کەی مرۆڤ نەخۆش دەکەوێت پێیان دەوت (جادوگەر بارۆ- baru) لەسیحرەکانی ڕۆنی زەیتی و ئاوو دووکەڵی بەکاردەهێنا یان یان بە پشکنینی (زراو) و چاودێری هەسارەکان چارەسەری نەخۆشی دەکرد .

پاشتر (پزیشك) بەمانای هاوچەرخ دەركەوت ، واتا پشكنینی (نەخۆشی) و چاودێری حاڵەتەكەی بۆ زانینی نەخۆشییەكەی و دەست نیشانكردنی ئەو نەخۆشییە دیاریكردنی دەرمان و چارەسەری گونجاو . ئەو كەسە كە بەم ئەركە هەڵدەستا لەزمانی ئەكەدی پێیان دەوت ئاسۆ(asu) واتا (پزیشك) لە قوتابخانەی تایبەتی دەیخوێند، وەكو قوتابخانەكانی (نەفەر و ئیسن و پورسپا و وەركا) .. و لەكاتی ئەنجامدانی كارەكانی جلوبەرگی تایبەتیان لەبەردەكرد.

یاسای (حامورابی) لەزیاتر لەیەك بەند لە بەندەكانی ئاماژەی بە(پزیشك) كردووە . بۆ نموونە ئەگەر هاتوو نەشتەرگەریەكی سەرنەكەوتووی بەكارهێنا چۆن سزا دەدرێت .

نەخۆشخانە نەبوو، بەڵام پزیشك سەری لە نەخۆشەكان دەدا لە ماڵی خۆیان . لێیانی دەپرسی، دەرمانی بۆ دەست نیشان دەكرد. لە خوێ و هەندێ بەرهەمی ئاژەڵی و كانەكان سوودیان وەرگرتووە بۆ چارەسەری نەخۆشی . هەندێك ڕێگەی كیمیاییان بۆ پێكهێنانی دەرمانەكان زانیوە . وەكو گەرمكردن و دڵۆپاندن و پاڵاوتن، پزیشكەكان بۆ خۆیان دەرمانیان ئامادە دەكرد .

## د-كیمیا:

دانیشتوانی دۆڵی دووئاوان (دۆڵی ڕافیدەین) هەر لە زووەوە بەتوانا بوون لە بواری كیمیادا، گڵكارو دروستكردنی قاپ و كاسە و ڕەنگ كردنی كردەیەكی كیمیایی بوو، هەروەها دروستكردنی كانزاكان و تێكەڵكردنی مس لەگەڵ تەنەكە بۆ دروست كردنی پارچەی (برۆنز) و لە بواری زێڕ دروست كردن و پككردنەوەی لەخڵتە بە كردە كیمیاییەكان دادەنرا.

دانیشتوانی ئەم ناوچەیە (دۆڵی دووئاوان) لە زۆر بواردا داهێنەر بوون بە تایبەتی لە بواری خشڵ و ملوانكەی زێڕین، هەروەها پیشەسازی شووشەیان هەبوو، جگە لە بواری پێست و ڕەنگ كردنی جل وبەرگ و دروست كردنی سابون و ڕۆنە ڕووەكییەكان.

## حەوتەم: هونەر و بیناسازی :

سەرەتای بەرهەمەکانی بواری کارە هونەری و دەستییەکان لەلای خەڵکی (دۆڵی دووئاوان) بە پیشەسازی دەفرو گڵکارو پێویستییەکانی ناو ماڵ بوو، ئەمەش بە شێوازی جۆراوجۆر دروستیان دەکرد و پاشان ڕەنگیان دەکرد و دەیانڕازاندنەوە مرۆڤ لە سەردەمی (حەلەف) دا زۆر کەل وپەلی دەفر و دەوری و کاسەی گڵکاری دروست کردووە کە بە وردەکاری و بەکارهێنانی ڕەنگ جۆراوجۆر و جوانی لەخۆ گرتبوو زۆر شێوەی ڕووەك و ئاژەڵ و شێوە ئەندازەییەکان لەسەر ئەم کەل وپەلانە دەنەخشێندرا.

### أ- مۆرە لوولەییەکان:

ئەم جۆرە مۆرانە لەسەردەمی شارستانییەتی (حەلەف) پێشکەوتنیان بە خۆوە بینی بە شێوەیەك بەکارهێنانی وەك نەسین گونجاوتربوو لەسالانی (٣٥٠٠-٢٨٠٠ پ.ز) دوای ئەوەی شێوەی لوولەیی وەرگرت و ئەم جۆرە مۆرانە لە شوێنەواری (وەرکا) دۆزراوەتەوە.

مۆری لوولەیی لە بەردێکی لوولەیی (شێوەبازنەیی)پێکهاتووە، کێلەکەی (نیوەتیرەی) لە سانتیمەترێك یان زیاتر بووە و درێژی (٢-٨سم)دەبێت، کە لە بەردی بەنرخ و کانزاو فەخفوری دروست دەکرا و لە ناوەڕستیدا کونێکی تێدایە و بە دەزوویەك لەمل دەکران، تاوەکو ون نەبێت، زۆرکەسیش مۆری تایبەت بەخۆیان هەبوو ناوی خۆیان لەسەری دا هەڵدەکەنران و بەشێوەیەکی پێچەوانە تاوەکو لەسەر پارچە قوڕینەکان بە جوانی دیار بێت، زۆرجار لەسەر ئەم مۆرانە نەخش و نیگار و شێوەی دیمەنە سروشتییەکان و وێنەی ئاژەڵی خەیاڵی و وێنەی جوان و ململانێی پاڵەوانان لەسەر ئەم جۆرانە دەنەخشێنرا، بووە بوارێکی چڕ و پڕی نەخشکردن لە سەریدا، بۆیە دەکرێ پشت بەم مۆرانە ببەسترێ بۆ توێژینەوە لە جیاوازییەکانی و خاسیەتەکانی هونەر لە سەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی دیکە، هەندێك لەو مۆرانە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی نیمچە دەوڵەتە سۆمەرییەکانی شار. هەروەها سەردەمی ئەکەدی مۆری خۆی هەیە، هەروەها مۆری

سەردەمی ئاشورییەکان، مۆری لوولەییەکان بە ڕواڵەتێکی گرنگ و هەرە دیاری شارستانی (دۆڵی دووئاوان) دادەنرێت، بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ بەکاردەهات هەرچەندە لەگەڵ گۆڕانکاریە پێشکەوتنە شارستانییەکان مۆری لوولەییەکان گۆڕانیان بەسەردا هات لەڕووی قەبارەی مۆرەکە و نەخش و بابەتە هونەرییەکانی سەری، لەڕووی شارستانییەوە کۆمەڵگای ڕۆژهەڵاتی کۆن ئەم جۆرە مۆرانەیان لە دانیشتوانی کۆنی دووئاوان وەرگرتووە .

## ب- پەیکەرتاشی:

دانیشتوانی عێراقی کۆن لە بواری پەیکەرتاشی بەهرەدار و باڵادەست بوون، زۆر نموونە و ئاسەواری ئەم شارستانییەتە جێماوە، ئەو پەیکەرانەی لەسەر بەرد و تاتە بەردو کێڵە (میل) هەڵکۆڵدراون ژمارەیان لە پەیکەرە (موجەسەمەکان) کە بۆ کەسایەتی و خواوەندەکان دروستکراون زیاترە. لەوانە سەری کچێکی سۆمەری شوێنەواری لە دێرینی (وەرکا) دۆزراوەتەوە لە (مەڕمەڕ) دروست کراوە، هەروەها چەندین پەیکەری کەسایەتی دیکە کە لە گڵکار (فەخفوری) دروست کراوە لەناوچەی (دیالە) دۆزراوەتەوە، لەشاری (نەینەوا) پەیکەرێك دۆزراوەتەوە لە (برۆنز) دروست کراوە وێنەی (پاشا سەرجۆنی ئەکەدییە).



سەری کچە سۆمەرییەکە

میری سۆمەرییەکان (گۆدیا) چەندین پەیکەری جێهێشتووەکە لە بەردی (دیواریتی) ڕەش دروست کراوە و زۆر نووسراوی لەسەر ڕوویدا هەیە، کە میری سۆمەری وا دەردەکەوێت بە شێوەیەکی بچووك و سەرو ڕیشی تراشاوە، ئەمەش وەکو ڕێزێك بۆ پەیکەری خواوەند کە هەردەم پەیکەری شێوە گەورە بوون، لەگەڵ گەورەکردنەوەی هەردوو چاو و هەردوو گوێ.

پاشای ئەکەدی (نەرام سین) چەندین پەیکەری جێ هێشتووە یەکێ لەوانە پەیکەری ناوچەی (دەربەندی گاور) کە نزیك (قەرەجاغ) لە کوردستان دا، کە تیایدا پاشای ئەکەدی وا دەردەکەوێت کە بەسەر شاخ دا هەڵدەگەڕێت و تاجی قۆچداری لەسەرە، ئەمەش هاوشێوەی میلی سەرکەوتنە کە شا (نەرام سین) دەردەخات کە سەرکەوتبوو بەسەر (لۆلۆییەکان).

لەساڵی (١٩٧٥ز) دا پەیکەرێکی برۆنزی دۆزرایەوە لە گوندی (باسلەکێ)کە لە نێوان شاری(سێمێل و زاخۆ) کە پەیکەری (نەرام سین)ی ئەکەدی بوو.

هونەری پەیکەر تاشی لە لای ئاشورییەکان زۆر گەشەی سەندبوو، ئەمەش بەزۆری پەیکەری خواوەندەکان و پاشاکانیان خۆی دەنواند، هەروەها پاشا ئاشوورییەکان تابلۆی دیواربەندیان لە کۆشکەکانیان هەڵدەواسی،



گۆدیا میری سۆمەری

کـە لەسـەری دا وێنـەی جەنـگ و جەژنـی شـێریان نەخشـاند بـوو، هەروەها (میلـی ڕەش)ی پاشا(شەلمەنەسـری سـێیەم) وێنەیەکـی ئـەم جـۆرە پەیکـەرە دیارانەیـە کـە تیایـدا پاشـا دەرکەوتـووە و وەسـتاوە و پێشـوازی لـە هاتنـی میللەتـە ژێردەسـتەکان دەکات، پاشـای ئاشـووری (سـەنحاریب) زۆر پەیکـەری دیـاری لەسـەر بەردەکانـی زێی(کۆمـل) لـە نزیـك دەربەنـدی (باڤیـان) لـە نزیـك گونـدی (خەنـەس)، تیایـدا پاشـا وەسـتاوە و لـە بەرامبـەر خواوەنـدی ئاشـورییەکان دا، ئـەم دیمەنـە لـە چـوار کـەژاوەی نەخشـێنراو دەردەکەوێـت لەسـەر بـەردی (ئەشـکەوتی هەڵامەتـا) لەسـەر چیایـەك لـە باشـووری شـاری دهـۆك. ئـەو کاتـە پەیکەرتاشـی ئاشـووری گەیشـتە لوتکـە، کاتێـك کـە پەیکـەری زۆر گەورەیـان دروسـت کـرد و تیایـدا (فریشـتەی پاسـەوان-الملاك الحـارس) وەك (گا) دەردەکەوێـت و باڵـی هەیـە، پەیکەرەکـە لـە قەبـارەی گایـەو، بـەڵام سـەری مرۆڤـی پێوەیـە و دوو باڵـی هەیـە و پێنـج قاچیشـی هەیـە، ئـەم پەیکەرانـە لەسـەر دەروازەی کۆشـکی پاشـاکان دانرابـوون، تاوەکـو گەورەیـی و شـان و شـکۆ بـدات بـە کۆشـکی پاشـاکان و هێمـای بەهێـز و دەوڵـەت نیشـان بـدات.



گای باڵدار

## ج- بیناسازی:

وەکو لەوە پێشتر باسمان کرد کە دانیشتوانی (دۆڵی دووئاوان) لە بیناکردنی پەرستگا و زەقورە بەناوبانگ بوون، و بۆبیناکردنی قوڕ و بەرد و خشتی سووریشیان بەکارهێناوە و بە نەخش و نیگاری سەر دیوار و کەمەرە و وێنەکێشانی ڕەنگا و ڕەنگ دەیانڕازاندەوە، پاشماوەی پەرستگا و کۆشکەکان لە لای دانیشتوانی دۆڵی دووئاوان بەڵگەی گەشەسەندنی هونەری (بیناسازییە) لەو سەردەمە. خەڵکی سادە و ئاسایی خانووەکانیان لە قوڕ دروست دەکرد زیاتر لە ژووری بچووك پێکدەهات، هەروەها (کا و دار و قوڕ)بەکار دەهات بۆ ئەوەی سەرەکەی پێ بگرن، خانووەکە سەرەتا وەك شێوەی (کەپری لاکێشەیی) بوو، پاشان شێوازی بانی ڕاست بەکارهات و چەند پایەیەك دادەنران بۆ وەشانی دیوارەکان، دەرگای خانووەکان لە دار دروست دەکران و پەنجەرەی بچووکی هەبوو بۆ هاتنە ژوورەوەی ڕووناکی، بیناسازییەکان ڕۆژهەڵاتی بوون بە شێوەیەك ژوورەکان و کۆگاکان لەتەك یەك بوون لەناوەندیشیاندا گۆڕەپانێك هەبوو، هەروەها خەڵکی ئەوکات ڕەچاوی ئاوو هەوایان کردووە لە دروستکردنی ئەم خانوانەدا، تاوەکو لە سەرەتای زستان و لە گەرمای هاوین بیانپارێزێت.

### بنیاتنانی کۆشکەکان:

میرو پاشاکان کۆشکەکانیان دروست دەکرد و دەبووە نێوەندی ڕامیاریو کارگێڕی، بۆیە قەبارەی ئەو کۆشکانە زۆر گەورە بووە و چەندین ژووری زۆری هەبوو کەبە گۆڕەپان دەور درابوون. چەندین کۆشك و تەلاری پاشا و میرەکان دۆزراوەتەوە کە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی سۆمەرییەکان لەوانە لە شوێنەوارەکانی (ئەریدۆ)و(کیش)و(ماری).
وەك کۆشکی (نەرام سین) لە تل براك لەسەر ڕووباری (خابوور)لە سوریا کە کۆشکی پاشایەتی بوو ئاماژە بەمەودای فراوانی دەسەڵاتی ئەکەدی و باڵادەستی بەسەر ناوچەی (ڕۆژهەڵاتی نزیك)دەکرد.کۆشکەکەی لەوێ دا دروست کرد بۆ کۆکردنەوەی باج، هەروەها(ئەکەدییەکان) لەشاری (ئاشوور) کۆشکێکی دیکەیان بنیات نا.

لەشاری (ئور) کۆشکێکی پاشایەتی دۆزرایەوە کە پاشا (ئورنەمۆ) بونیادی نابوو.درێژی(هۆڵی پاشایەتی) ئەم کۆشکە نزیکەی(٢٤*٤م) دەبێت، هەروەها هۆڵی پاشا (زمری لم) لە شاری (ماری) نموونەی ئەو کۆشك و تەلارە گەورە و فراوانانەیە. لێکۆڵەوەران ژمارەی ژوورەکانی ئەم کۆشکەیان (٣٠٠) ژوور مەزەندە کردووە، هەروەها هۆڵی پاشایەتی چەندین ژووری دیکەی لێ پێك دێت و ژوورێکی تایبەتی تیایە بۆ وانە وتنەوە، هەوەها بەشێك لە کۆشکەکە چەندین(کۆگاو ژێر زەمینی)تێدایە. کۆشکەکە لەسەر لەسەر ڕووبەرێکی فراوان دروست کراوە و شورایەکی گەورە دەوری داوە و تەنها دەرگایەکی هەیە. پەیکەرتاش و هونەرمەندان زۆر بەهرەو توانای خۆیان خستبووە گەڕ کە چەندان نەخش و نیگار و ڕازاندنەوە و شێوە و ئامڕازی هونەری جۆراو جۆری تێدابوو. بنیاتنان و دروستکردنی کۆشك و تەلار لای ئاشوورییەکان پێشکەوتنی گەورەی خۆیەوە بینی و بەردیان لە بنیاتنانی ئەم کۆشکانە بەکار هێنا. لە شاری (ئاشوور) کۆشکێکی پاشایەتی دۆزرایەوە کە دەگەڕێتەوە بۆ پاشا(ئەدەد نەرای یەکەم)و، کە لە دوو بەش پێکهاتبوو یەکێکیان شوێنی حەوانەوەی بنەماڵەی فەرمانڕەوا بوو، ئەوی دیکەیان بەشی بەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەت بوو، هەروەها کۆشکی پاشا (ئاشوور ناسر بالی دووەم ) کە لە شاری (نەمرود)دروست کراوە نموونەیەکی دیکەی کۆشکی پاشایەتییە، کە بیناسازان و شارەزا و بەهرەداران لە بواری بیناسازی لە ناوچەی دەریاچەی (وان) هێنرابوون. هەروەها چەندین کۆشکی دیکەی پاشایەتی بنیات نراوە لەوانە کۆشکی پاشا (سەرجۆنی دووەم) لە(خرسباد)و ئەو کۆشکانەی هەریەك لە (سەنحاریب)و (ئەسەرحەدون) و(ئاشوور بانیبال) لە شاری (نەینەوا). ئەو کارە بیناسازیانەی پاشای بابلی (نەبو خزنەسەر) پێ ی هەڵساوە ئاماژەن بۆ پلەی پێشکەوتن و گەشەسەندنی هونەری بیناسازی لای دانیشتوانی (دۆڵی دوو ئاوان) ئەوی جێماوەی لە شاری بابلی کۆن لە پاشماوەی کۆشك و پەرستگا دەسکەوتی ئەم پاشایەیە کە(باخچە هەڵواسراوەکان)دروست کردووە، دروستکردن و بنیاتنانی (دیوارو شوراو قەڵاو دەرگاکان و قەڵغانەکانی بەرگری و جەنگ) نموونەیەکی دیکەی ئەندازەو هونەری بیناسازی بوو لە وڵاتی (دۆڵی دوو ئاوان).

## پرسیارەکانی بەشی دووەم

پ١/ چۆن سیستەمی حوکمڕانی لە باشووری دۆڵی دوو ئاوان دروست بوو؟

پ٢/ هۆیەکانی سەرهەڵدانی سیستەمی (ڕژێمی) (پاشای جێگیر) چی بوو؟

پ٣/ قۆناغەکانی گەشەسەندنی نووسینی مسماری ڕوون بکەوە .

پ٤/ بەراورد بکە لە نێوان یاسا سۆمەرییەکان و یاسا سامییەکان .

پ٥/ پەیوەندی لە نێوان ئایین و سروشت و جەژنەکان چی بوو.

پ٦/ ڕاپۆرتێك لەسەر شاری بابل بنووسە .

# سەرچاوەکانی بەشی دووەم


١- طه باقر، مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة، ط٢، (بغداد: ١٩٥٥).

٢- عامر سليمان، العراق في التاريخ القديم، موجز التاريخ الحضاري، دار الكتب، (الموصل:١٩٩٣).

٣- عامر سليمان وفاضل عبد الواحد، عادات وتقاليد الشعوب القديمة، (بغداد:١٩٨١).

٤- نخبة من الباحثين، حضارة العراق، (بغداد -١٩٨٥).

٥- هاري ساكز، عظمة بابل، ترجمة عامر سليمان، (الموصل ٩١- ١٩٧٠).

٦- فوزي رشيد، الشرائع العراقية القديمة، ط٢، (بغداد: ١٩٧٨).

# بەشی سێیەم




## پێشەکی:

بارودۆخی ژینگە لەبار بوو بۆ نیشتەجێبوونی مرۆڤ لە دۆڵی نیل و بونیادنانی شارستانیەك كە پشتی بە كشتوكاڵ بەستووە، ئەمەش بەهۆی بەپیتی خاكی دۆڵ و زۆری ئاوی ڕووباری نیلەوە، شارستانییەتی میسری لە كۆشكی ئارامی دامەزراوە، چونكە میسر بە بیابان و دەریا دەور دراوە دوور بووە لە دەست بەسەراگرتنی داگیركەران، هەروەها ڕوودانی لافاوی ڕووباری نیل بەشێوەیەكی ڕێك و پێك زانینی كاتی ڕوودانی لەلایەن خەڵكەوە ئەمەش وای كردووە دڵنیایی زیاتری پێ بەخشیبوون، جگە لەوەی ژینگەی سروشتی میسر بەدوور بووە لە كارەساتی لەناكاوی بۆیەش دانیشتوان بە هێمنی بڕوابەخۆبووەوە كاریان كردووە، بە پێچەوانەی دانیشتوانی دۆڵی ڕافیدەین(دۆڵی دووئاوان) كە لە ژینگەیەكی سروشتی و كۆمەڵایەتی ناجێگیر ژیاون پڕبووە لە شتی چاوەڕوان نەكراو، ئەمانەش هەموو وایانكردووە میسرییە كۆنەكان باوەڕیان بەخودا و فەرمانڕەوایەتی بەهێزبووە، ئەم بڕوابوونە ڕەنگدانەوەی هەبووە لەسەر گرنگیدان بە ژیانی دیكە و دروستكردنی گۆڕ، تاوەكو شارستانییەتی مردووان ناوبراوە، بەڵام دانیشتوانی دۆڵی ڕافیدین باوەڕیان بە خواوەندو فەرمانڕەواكانیان لاواز بووە، چونكە نەیانتوانیوە خەڵكی لە كارەساتەكانی سروشتی یاخود داگیركردن

بپارێزن، بۆیە بایەخیان بە ژیانی دواتر کزبووە و گرنگیان بە ژیانی دونیا داوە، بەهۆی لێکچوونی زۆربەی دیاردە شارستانییەکانی دۆڵی رافیدین و دۆڵی نیل، بۆیە باس لەو دیاردانە دەکەین کە میسرییەکان تێیدا بە ناوبانگن لەگەڵ بەراورد کردنێك لە نێوان هەردوو شارستانیەکە.

## یەکەم: ڕژێمی فەرمانڕەوایەتی :

میسر بۆماوەیەکی دوورو درێژ دابەشکرابوو بە ولایەت یاخود دەوڵەتی شار کە بووە هۆی دابەشکردنی دانیشتوانی (صعید) و دانیشتوانی دەلتا، لە سەرەتای هەزارەی سێیەمی پ.ز مینا پاشا توانی میسر یەکبخات، ئەو کەسانەی کە لە پاشا نزیك بوون بانگەشەی ئەوەیان دەکرد ((یەکگرتنی میسر کارێکە لە توانای مرۆڤ بەدەرە، ئەوەی بەم کارە هەڵبستێ ئەوە خواوەندە)) بیرۆکەی بەخواوەند بوونی پاشاو بانگەشەی بۆکرا و لەنێوان خەڵکیدا بڵاوبۆوە، ئەم بیرورایە بۆ ئەو پاشایانەی کە دوای مینا پاشاش حوکمیان کرد مایەوە پارێزگاریان لێکرد، وای لێهات پاشای میسر لە تێڕوانینی ڕەسمی خوا بێت، جێبەجێ کردنی فرمانی و وتەکانی بەیاسا دادەنرا و پێویستی بە دەرکردنی یاسا نەدەکرد، بۆیە یاسای نووسراوە لە میسر سەری هەڵنەداو پاشا بەگوێرەی نەریتی باوو حوکمی دەگێڕاو دەسەڵاتی ئایینی و دونیایی بەدەست پاشاوە بوو، نیشانەکان وا پیشان دەدەن کە پاشای میسری بەتایبەت پاش مردنی پەرستراوە، بەهۆی گرنگی پلەو پایەی پاشا گۆڕی مەزنیان بۆ ناشتنی هەڵکەندنەوەو دواتر پەرەی پێدراوە بۆتە ئەهرام، ئەوانەی کە یارمەتی دەری پاشا بوونە لە بەڕێوەبردنی وڵاتدا ژمارەی میرو فەرمانبەرو نووسەری پایتەخت بوون، فەرمانڕەوایی هەرێمەکان هەڵساون لە بەڕێوەبردنی هەرێمەکان لە پایتەخت و بایەخیان داوە بە کۆکردنەوەی باج و ناردنی بۆ پایتەخت.

خەڵکی نەوێراوە سەیری پاشا بکا، هەروەها بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ گفتوگۆیان لەگەڵدا نەکردووە، بەهۆی بەپیرۆز سەیرکردنیان پێیان گووتوە

((ڕێزدارمان و سەروەرمان)) و لەسەردەمی پاشانشینی هاوچەرخدا نازناوی فیرعەون سەریهەڵدا کە مانای (ماڵی گەورە) یاخود(کۆشکی گەورە) ئەو نازناوە بە پاشای میسر گوتراوە و پێی ناسراوە.
نابێ دژ بە پاشا بوەستن یاخود شۆڕشی لەسەر بکەن ، چونکە بە بۆچوونی فەرمی (رەسمی) لەهەڵە بەدەرە، چونکە خواوەندە، سەرەڕای ئەوەی کە فیرعەون خواوەندە و دەسەڵاتی بێ سنوور بووە، کەچی ئاگاداری هەڵسوکەوتەکانی بووە و هەوڵی داوە دادپەروەری جێبەجێ بکات خراپەی بۆ خەڵك نەبێ یاخود ئازاریان نەدات، دەبوایە بەشێوەیەکی جوان و بە ئەدەبەوە هەڵسوکەوت بکات هەروەك خواوەند، لەسەرەڕۆیی مرۆڤ بەدوور بێت، ئەم جۆرە ڕژێمە وایکردووە سەربەستی پەیوەست بێت و ڕەفتارو مامەڵەی لەگەڵ خەڵکیدا باش بێت.

## دووەم: بیروباوەڕە ئاینییەکان:

میسرییەکان هێزێکی کاریگەر لەسەر ژیانیان پەرستووە،خۆر گرنگییەکی مەزنی هەبووە، چونکە کاریگەرییەکەی لەسەر چالاکی میسرییەکان و کرداری گەشەکردن و چاندن هەبووە، وای لێهاتووە خۆرهەڵاتن یاخود ئاوابوونی دیاردەیەك بێت ببێتە پێویستییەکی مرۆڤی میسری زیاتر لە هەر مرۆڤێکی دیکە، ئەویش بەهۆی بێگەردی ئاسمانەکەی لە زۆربەی ڕۆژانی ساڵدا.
لە دەڵتا خواوەندی خۆر بە خواوەندی (رەع) ناوبراوە لە (تیبە) بەخواوەندی (ئامون)ناسراوە، فیرعەونی میسر ئەخناتون بیرۆکەی یەکگرتن و یەکبوونی هێناگۆڕێ بۆ ئەوەی یەك خودا بپەرستن کە پێی دەگوترا (ئاتون)واتە (جەستەی ڕۆژ)وادیارە بیرۆکەی یەکگرتنی لە میتانییەکان وەرگرتووە لەژێر کاریگەری خێزانەکەی تیدو خیبا (نفرتیتی).
میسرییەکان ڕووباری نیلیان بەپیرۆز داناوە و بەخوایان داناوە و هۆی ڕێك و

پێکـی ڕووبـاری نیلیـان بەسـتۆتەوە بـە ئەفسانەی خواوەنـدی ئوزیریـس و ژنەکـەی ئیزیـس و ئەویـش کاتێـك خواوەنـد (سـپ) براکـەی (ئوزیریـس)ی کوشـتووە، ژنەکـەی خواوەنـد ئیزیـس بـۆی گریـاوە فرمێسـکەکەی کەوتۆتـە نـاو ڕووبـار و بۆتـە هـۆی لافـاو ئینجا خواوەنـد حۆرس کـوڕی ئوزیریـس هەڵسـاوە بـە کوشـتنی مامـی (سـپ)،دایکی ئیزیـس وازی لـە گریـان هێنـاوە و ئەمەیـان بەسـتۆتەوە بـە کۆتایـی هاتنـی وەرزی لافـاو.

میسـرییە کۆنـەکان ژمارەیەکـی زۆریـان پەرسـتگا بوونیادنـاوە و پەیکـەری خوداکانیـان تێـدا دانـاوە، ئەهرامـەکان و ئـەو پەرسـتگایە تابوتانـەی کـە پەیوەسـت بـوون پێیـەوە بوونـە بەشـوێنی پەرسـتنی پاشـا مـردووەکان و درووود لێـدان لەسـەر گیانیـان.



**خواوەند ئیزیس شیر بە خواوەند حۆرسی کوڕی دەدات**

ئوزیریـس خـوای مـردن بـوو و پـاش مردنـی مـرۆڤ، ئوزیریـس دەبێتـە پاشـای مـردوو و فەرمـان دەدات بـە لێپێچینـەوەی و تەرازوێـك دادەنـرێ بـۆ پێوانەکردنـی کردارەکانـی مردووەکـە و ئـەو کەسـانەی چاکـن ئـەوە گیانیـان دەچێتـە جیـهانی نەمری، بەڵام گوناهبـاران گیانیـان لەنـاو دەچێـت و نامێنـێ. خـوای ئەنوبیـس (چەقـەڵ) لێپرسـراوی ڕۆژی حسـابکردن و ڕاگرتنـی تـەرازووی مردووانـە.

## سێیەم: نووسـین:

میسـرییەکان لـە سـەرەتاکانی هـەزارەی سێیەمی پ.ز ڕوویـان کردۆتـە نووسـین هێمـای نووسـینیان بەکارهێنـاوە کـە بریتـی بـووە لـە وێنـەی بچووکـراوەی ڕووەکـەکان و باڵنـدە ناسـراوەکان لەگـەڵ هێمـای دیکـە، بۆیـە عەرەبـەکان ناویـان لێنـاوە زمانـی چۆلەکـە و نەیانتوانیوە بیخوێننـەوە، توێـژەرەوان نووسـینی میسـرییەکانیان ناونـاوە نووسـینی هیرۆگلیفـی یـان خەتـی پیـرۆز، میسـرییەکان لەسـەر گـەڵای ڕووەکـی (زەل، بەردیـە) نووسـینیان نووسـیوە، ئەویـش پـاش ئامادەکردنـی کـە دەتوانـری لـوول بـدرێ و لەنێـو دەفر و دیـوار هەڵبگیـرێ، بێگومان ئەو نووسـینە بە شـێوەیەکی سـتوونی دەنووسـران، بەجۆرێك خەتەکانی لەیـەك ئاسـتدا بـوون و لەڕسـتەوە بـۆ چـەپ دەخوێنرانـەوە، لەکاتێکـدا نووسـینی مسـماری بەشـێوەیەکی ئاسـۆیی دەنووسـرا و لـە چەپـەوە بـۆ ڕاسـت.

کاهینـەکان خەتـی هیرۆگلیفیـان پەرەپێـداو ناویاننـا خەتـی (هیراتیقـی) کەچـی میللـەت بەگشـت خەتێکـی سـادە و سـاکاری بەکاردەهێنـا پێـی دەگوتـرا خەتـی (دیموتیقـی)، هەندێـك لـەو بەردیانـەی کـە بـە خەتـی هیرۆگلیفـی لەسـەری نووسـراوە وەکـو خـۆی ماوەتـەوە لەوانـەش بەردیـەی تۆریـن کـە نـاوی ژمارەیەکـی زۆر لـە پاشـاکانی میسـری لەسـەر تۆمارکـراوە، زانـای فەڕەنسـی فرانسـوا شـامبلیون توانـی سـاڵی ١٨٣٢ ز هێمانـی خەتـی هیرۆگلیفـی لێـك بداتـەوە بیـان خوێنێتـەوە.

مایـەی ئامـاژە پێدانـە کەدانیشـتوانی وڵاتـی شـام سـوودیان لـەم نووسـینی هیرۆگلیفـی وەرگرتـووە پیتـی هیجائیـان لـێ پێکهێنـاوە و فینیقییـەکان لە ڕێگەی بازرگانییـەوە بـۆ وڵاتـی ئەغریقیـان گواسـتەوە و لـە ڕێگـەی ئەوانیشـەوە لـە ئەورووپـا بڵاوبـووە و ئارامییـەکان بـۆ ڕۆژهەڵاتیـان گواسـتۆتەوە.

## چوارەم: پزیشکی:

میسرییەکان لەبواری پزیشکدا لە پێشەوەی دانیشتوانی دۆڵی رافیدین بوون، ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئەوان هەڵساون بە توێکاری (تشریح) تەرمی مردوو و دەرهێنانی (ڕیخۆڵەکانی هەناو) و مۆمیاکردنی لاشەکە، ئەمەش یارمەتی ئەوەی داون کە شارەزایی ئەندامەکانی لەشی مرۆڤ و فەرمانەکانیان بن و ئەو نەخۆشیانەشی کە تووشیان دەبێت، نەخۆشییەکانی گەدە و فەرمانی دڵ و دەمارەکانیان زانیوە و بۆیان دەرکەوتووە کە دڵ هێزی بزوێنەرە لە لەشدا، هەروەها فەرمانی مێشك (مخ) و کاریگەری مێشك لەسەر دەمارەکانی لەش و پەیوەندی مێشك پێیەوە و کایگەری بەسەر فەرمانی ئەندامانی دیکەی لەشەوە زانیوە.

بەردیەی (زەل) ئەیبرس دۆزرایەوە و ئێستا لە زانکۆی لایزك پارێزراوە و کۆمەڵی ڕێنمایی پزیشکی پێك هاتووە، کە تێیدا باس لە (حەب) و بڕەکەیو چۆنیەتی بەکارهێنانی کراوە، هەروەها کۆمەڵەی مێژوویی لە نیۆیۆرك بەردیەکەی (زەل) میسری پاراستووە کە باس لە بابەتی نەشتەرگەریی دەکات و لەوانەش بابەتی لە گەچگرتنی شکان دەکات.

## پێنجەم: مۆمیاکردن:

میسرییەکان مۆمیاکردنیان دۆزیوەتەوە، مۆمیاکردن بریتییە لە مۆمیاکردنی ئەو بەشەی کە لە جەستەی مردوو ماوەتەوە، گەر کەسی مردوو دەوڵەمەند بووبێ ئەوا پیاوانی ئایینی (کاهینەکان) و دکتۆرەکان هەڵساون مۆمیاکردنی جەستەکەی و شێوازی سەرکەووتویان لەم کارەدا بەکارهێناوە،مۆمیاکردن بۆ ماوەیەکی درێژخایەن دەمایەوە کە هەزاران ساڵی دەخایەند، ساڵی١٩٢٢ گۆڕی فیرعەونی میسر(توت عنغ ئامون ) دۆزرایەوە کە تابوتەکەی لە زێڕ دروستکرابوو، لە ناوەوەی لاشەی مۆمیاکراوی تێدا بوو، لەم کاتەدا ئەم دۆزینەوەیە دەنگۆیەکی شوێنەواری سەرنجڕاکێشەری لێ کەوتەوە، لەوانەیە قوتابی بپرسێ مۆمیاکردن چییە؟ چۆن میسرییەکان فێری مۆمیاکردنی

تەرمی مردوو بوون؟ مەبەست لە مۆمیاکردن چییە؟
مۆمیاکردن مانای پارێزگاریکردنی لەشی مردووە لە لەناوچوون، بە لەشی مۆمیاکراو دەگوترێ (مۆمیا) لە زمانی کوردی مانای (مۆم) دەگەیەنێت، چونکە مۆمیان بەکارهێنا بۆ پڕکردنەوەی کونەکانی لەش پاش دەرهێنانی هەناوی. مۆمیاکردنی لاشەی پاشا یاخود شاژن بەگوێرەی ئەو هەنگاوانەی خوارەوە دەکرا:-
ا-تەرمەکە بە کەشتی دەگوازرایەوە بۆ پەرستگای دۆڵی نزیك لەو هەرەمەی کە ئامادە کرابوو بۆ ناشتنی.
ب-شووشتنی تەرمەکە و پاککردنەوەی ماوەیەکی کەمی دەخایاند.
ج-مۆمیاکردنی تەرمەکە کە پێویستی بە ماوەیەکی درێژ هەبوو کە دەگەیشتە (٧٢) ڕۆژ دەست دەکرا بە توێکاری تەرمەکە و دەرهێنانی (ڕیخۆڵەکان ) و لەڕێگەی بۆری تایبەتەوە (مێشك)یان دەردەهێنا و ئینجا تەرمەکە بەسۆدا مامەڵەی لەگەڵدا دەکرا دەخرایە نێو خوێی نیترۆن.
د-لاشەکە لە ئاوێتەی خوێکە دەردەهێنرا و کونەکان بە بەکارهێنانی قیر یاخود مۆم دەگیران.
ه-دەمی دەکرایەوە، ئەمەش بۆنەیەکی ئایینی بوو مەبەستی ئەوەبوو کە مردوو بتوانێ جارێکی دیکە قسە بکا و چێژ لەو قوربانیانە وەربگرێ کە لای دەکرێ.



تابوتە زێڕەکەی توت عنخ ئامون

## شەشەم:خانووبەرە:


رەمسیسی دووەم

میسر بە دەوڵەمەندترین وڵات دادەنرێ لە جیهان بەهۆی شوێنەواریەکانیەوە، ژینگە وشکەکەی و بەکارهێنانی بەرد یارمەتیدەر بوون لەسەر مانەوەی ئەو شوێنەوارانە، بیناسازی میسری بەچاکی لە بونیادی پەرستگا و ئەهرامەکان دەردەکەون، ئەو کەسەی سەردانی ناوچەی (دیر البحری و ئەقصر) دەکات لە صعیدی میسری ئەو شوێنەوارە بەرزانە دەبینێ، دیر البحری لەنزیك ئەو پەرستگایە بونیادنراوە کە شاژنی میسری حتشبسوت بنیاتناوە، گەشتیار دەتوانێ پاشماوەی ستوون (پایە)و هەیوان و هۆڵەکان ئەم پەرستگایە ببینێو لە نزیك ئەویشەوە پەیکەری خوا مەزنەکان هەیە و لەوانە پەیکەری (رمسیسی دووەم)کە بەشداری کردووە لە دووبارە چاککردنەوەی دیر البحری. پەرستگای کەرنەك لەتیبە بە گەورەترین پەرستگا دادەنرێ کە دروستکراوە و ژمارەیەك لە پاشاکانی میسر بەشداریان لە دروستکردن و فراوانکردنیان کردوە، ستوونە مەزنەکەی پەرستگاکە کە تا ئێستاش ماوەتەوە هێمای مەزنی شارستانییەتی میسر دەردەخات، لەسەر دیوارەکانی پەرستگای کرنك ئەو کارانەی کە فیرعەونی میسر کردوونی و ئەو پەیوەندییە سیاسیانەی کە لەگەڵ وڵاتانی دیکە گرێی داون تێیدا تۆمارکراون، هەروەها پەیمانامەی میسر لەگەڵ حیپیەکانیش لەسەر دیوارەکە نووسراوەتەوە، پەرستگاکە خۆی لە خۆیدا مۆزەخانەیەکی سروشتییە.



پەرستگای کەرنەك

## هەرەمەکان:

مێژوونووسان ماوەی نێوان (٢٧٨٠-٢٢٧٠)پ.ز لە میسر بە چەرخی ئەهرامەکان ناوناوە، چونکە دروستکردنی هەرەمەکان لەو ماوەیەدا گەیشتۆتە ئەو پەڕی، پاش دروستکردنی سێ هەرەمی گەورە لە جیزە لە ڕۆژئاوای نیل کەهەرەمی خۆفۆ و هەرەمی خفرەع و هەرەمی منکورع بوو. ئێوە زۆربەتان ئەو هەرەمانەتان لە تەلەفزیون دیوە کە بۆتە ڕووگە شوێنەوارناسان و گەشتیاران، بۆیە واچاکە شتێك دەربارەی بیناسازی هەرەمەکانی میسر بزانن.

دروستکردنی هەرەمەکان لە میسر سەرەتا پلە بە پلە سەری هەڵدا، سەرەتا بریتی بوو لە دروستکردنی تاتێك (سەکۆ)یەك بوو لەسەر گۆڕی پاشا و میرە مردووەکان. کە هەندێ کەلوپەل و پێداویستی تایبەت بە پاشا مردووکەی تێدا دادەنرا، پاشا زوسر کە یەکێکە لە پاشاکانی بنەچەی سێیەم هەڵسا بە دروستکردنی هەرەمێکی پلەدار کە (ئەمنحوتب) ئەندازیاری خانوو بۆی دروستکرد، ئینجا سەردەمی بنەچەی چوارەم دروستکردنی ئەهرامەکان پەرەی سەند لە هەرەمی پلەدارەوە گۆڕا بۆهەرەمی ڕاست.

**تەلاری هەرەمەکان لەمانە پێك دێن ؛**

١- هەرەم کە لە دەرەوە بە دیوارێکی دەور دراوە لە (خشت)دروستکراوە.
٢- پەرستگای تەرمەکە لە پێشەوەی ڕووی ڕۆژهەلاتی هەرەمەکە.
٣- پەرستگایەك لە پێش دەروازەی باکووری هەرەمەکە.
٤- هەرەمێکی بچووك بە دیوارێکی تایبەت دەوردراوە لە دەرەوەی دیواری دەرەکی هەرەمە سەرەکییەکە.
٥- پەرستگای دۆڵ کە ڕێگەیەکی درێژ بە هەرەمەکەی دەبەستێتەوە.

هەرەم بینایەکی بەهێزە و لە بەردی چوارگۆشەی بنچینەیەکی شێوەهەرەمی هەیە، کە لە بەردی گەورە دروستکراوە و لە ناوەوەی هەرەمەکە ڕاڕەوێکی درێژ هەیە کە لە باکوورەوە خوار دەبێتەوە دەست پێدەکات و کۆتاییەکەی بە ژوورێکی بەرامبەری دێت و پاشان دوو ڕاڕە و بۆ لای ڕاست و چەپ هەیە و ڕاڕەوی دەستەچەپ بە ژووری ناشتن و ژێر زەمینێك کۆتایی دێت کە شوێنێکی تایبەتە بە پەیکەرەکان.



هەرەمەکەی خۆفۆ



پەیکەری ئەبو هۆل

ئـەو هەرەمـەی کـە خۆفـۆ پاشـا لـە جیــزە دروسـتی کـرد بـە گەورەتریـن و بەرزتریــن هــەرەم دادەنــرێ، لــە دروســتکردنی ئــەم هەرەمــەدا بــەردی گەورەی بەکارهێنـاوە کـە کێشـی هـەر بەردێـك دەگاتـە(٢،٥) تـەن و ژمـارەی بەردەکانـی خـۆی لـە (٢،٣)ملیـۆن بـەرد دەدا و درێـژی لایەکـی بناغـەی هەرەمەکـە نزیکـەی (٧٥٥) پـێ دەبێـت و بەرزیەکـەی دەگاتـە (٥٠٠) پـێ، دەسـتی هەنـدێ لـە کەسـانی خراپـەکار گەیشـتۆتە هەرەمەکـە و هەنـدێ لـە بەردەکانـی لوتکـە و لایەکانـی لابـراون.

لـە نزیـك هەرەمـی جیـزە پەیکەرێکـی گـەورەی خفـرع پاشـا دانـراوە کـە پێـی دەگوتـرێ (ئەبوهـول) و بەشـی خـوارەوەی جەسـتەی پەیکەرەکـە شـێرە و بەشـی سـەرەکەی مرۆڤە،جلوبەرگـی پاشـایەتی لەبەرکـراوە، بـەرزی ڕووخسـاری ئـەم پەیکـەرە (٦٥)پـێ دەبـێ و درێـژی لەشـی دەگاتـە (١٨٧)پـێ و پانـی ڕووخساریشـی دەگاتـە (١٤) پـێ.

دروسـتکردنی هەرەمەکانـی جیـزە مانـای ئەوەیـە کە دەسـەڵاتی پاشـاکانی میسـر گەیشـتۆتە ئەوپـەڕی بەهێـزی کـە لـە سـەردەمی بنەچـەی پێنجـەم و شەشـەم و حەوتـەم نەیانتوانیـوە لـە دەسـەڵاتدا یەکبگـرن و تەنهـا دروسـتکردنی هەرەمـی بچـووك نەبێـت کـە هیـچ جیاوازیەکـی لەگـەڵ هەرەمەکانـی خانەدانەکانـدا نەبـووە، ئەمـەش بەڵگـەی لێـك هەڵوەشـانەی دەسـەڵاتی سیاسـی پاشـا بەدیـار دەخـات.

## پرسیارەکانی بەشی سێیەم

پ١/ ئایا هەموو میسرییەکان باوەڕیان بە خوایەتی پاشا هەبووە؟ ڕای خۆت دەرببڕە.

پ٢/ جیاوازی لە نێوان نووسینی هیرۆگلیفی و نووسینی مسماری بکە؟

پ٣/ شارستانییەتی میسری بە شارستانییەتی مردووان ناودەبرێت. ئەمە شی بکەوە.

پ٤/ لە دروستکردنی هەرەمە گەورەکانی جیزە چی تێدەگەین؟

پ٥/ گرنگی پەرستگای کرنك چییە؟

## سەرچاوەکانی بەشی سێیەم


١- احمد فخری، الاهرامات المصرية، (القاهرة،١٩٦٣)

٢- جون بوتيرو وأخرون، الشرق الاردنی الحظارات الكبيرة ترجمة عامر سليمان، (الموصل،١٩٨٦).

٣- جميس هنری برست، تطور الفكر والدين فی مصر القديمة، ترجمة زاكی سوسن، (القاهرة،١٩٦١).

٤- جميس هنری برست، انتصار الحظارة، ترجمة، احمد فخری(القاهرة،١٩٦٩).

٥- رشيد الناظوری، التطور التأريخی للفكر الدينی (بيروت، ١٩٧٦).

٦- ليونارد كوتيرل، زوجات الفراعنة ترجمة فيليب عطا (بيروت، ١٩٦٧).

٧- محرم كمال، تأريخ الفن المصری (القاهرة، ١٩٣٧).

٨- ولسن، الحضارة المصرية، ترجمة احمد فخری، (القاهرة،١٩٥١).

# بەشی چوارەم



## شارستانییەتی ئەغریقییەکان

وڵاتی یۆنان دەکەوێتە باشووری کیشوەری ئەورووپا و بەشی خوارووی نیمچە دوورگەی بەلقان پێکدێنێ و لە باشوورەوە لەناو دەریای ناوەڕاست درێژ دەبێتەوە، چەندین کەنداو ناوبڕی دەکات بۆ ئەوەی ئەرخەبیلیکی (کۆمەڵە دوورگەیەك) جوان پێك بێنێ، هەروەها چیاکانی لە ناوەوەی وڵات درێژبوونەتەوە و دەشتەکان بڵاوبوونەتەوە، ئەم وڵاتە ئاوو هەوای دەریای ناوەڕستی (مامناوەندی)هەیە، شوێنە جوگرافیەکەی لەنێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادایە وایکردوە کە دانیشتوانەکەی بەڕووی شارستانییەتی ڕۆژهەڵاتدا بکرێتەوە و پەیوەندیش بە ڕۆژئاواوە بکەن. هەروەها هەڵکەوتنی سروشتی جوگرافی وڵاتی یۆنان ڕێگەخۆشکەر بووە لە پەیدابوونی وڵاتی شار وەك ئەسینا و ئەسپارتە و میگارا و تیبە .

شارستانییەتی ئەغریقی کاریگەر بووە بەو شارستانیانەی کە لە نزیك وڵاتی یۆنان سەریانهەڵدا هەروەك شارستانییەتی ئیجە (بەناوی دوورگەکانی دەریاچەی ئیجە)کەپێشی دەڵێن شارستانییەتی مەبنەوی یان کریتی (بەناوی دوورگەی کریت) و شارستانییەتی مایسینا (بەناوی دوورگەی مایسینا) بەهۆی ئەو هەڵکەوتنە سروشتە جوگرافیەکەی لە ڕێگەی دەریای ناوەڕاستەوە لە کەنارەکانی دەریای ئیجە و دەریای مەڕمەڕە و دەریای ڕەش و کەنارەکانی ئیتاڵیاو کەنارەکانی ئەفریقیا بڵاوبوونەتەوە، ژمارەیەك بنکەی بازرگانیان لە دوورگەکانی دەریای ئیجە دامەزراندووە و خەڵکی تێدا نیشتەجێ بووە، و کولتووری شارستانییەتی خۆیانیان بۆ گواستۆتەوە.

## بەناوبانگترین دیاردە شارستانییەکان:

### یەکەم: سیستەمی فەرمانڕەوایەتی:

#### أ- سیستەمی ئەولیکاریکی:

واتا دەسەڵاتی کەمینە لە شاری ئەسپارتەدا جۆرە ڕژێمێکی فەرمانڕەوایەتی سەری هەڵدا کە هەردوو دەسەڵاتی ڕەها(بێ سنوور)و دیموکراتی لەخۆگرتبوو، دوو پاشا دەسەڵاتیان بەڕێوەدەبرد، لەگەڵ ئەنجومەنێکی پیاو ماقوڵان(نبلا) کە لە (٢٨) ئەندام پێك هاتبوو، و کۆمەڵەیەکی گشتی هەبوو کە هەموو خەڵکی ئەسپارتە لەخۆگرتبوو، ئەوانەی تەمەنیان لە سی ساڵی زیاتر بوو، ئەم کۆمەڵەیە مانگی یەك جار کۆدەبۆوە، بەڵام مافی پێشنیارکردن و گفتوگۆکردنی نەبوو، گەل بۆ ماوەی ساڵێك پێنج نوێنەری لێ هەڵدەبژارد تاوەکو چاودێری جێبەجێ کردنی یاسا بکەن.

لەبەر ئەوەی دەسەڵاتی پاشا فراوان بوو مافی ڕاگەیاندنی شەڕ و پەیمانبەستن لەدەست خۆی بوو، بۆیە ڕژێم لە ئەسپارتە نەگەیشتۆتە ئاستی دیموکراتیەت، ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئابووریەکەی پشتی بە کشتوکاڵ بەستبوو نەوەکو بازرگانی، وای لێهات خاوەنی زەوی دەستێکی باڵای هەبێت لە بەڕێوەبردنی وڵاتدا، بۆیە ڕژێمی فەرمانڕەوایەتی لە ئەسپارتە بەدەسەڵاتی کەمینە یاخود ئەو لیکارکی ناونراوە. سروشتی ڕژێمی ئەولیکاریکی لە پەروەردەی ئەسپارتەدا توندوو تیژ بوون، چونکە ئامانجی بریتی بوو لە ئامادەکردنی پیاوان بۆ ئەوەی ببتە جەنگاوەرێکی توندو تۆڵ و بەجەرگ و چاو نەترس، بۆیە خۆیان لە منداڵی بێ هێز ڕزگار دەکردو پەروەردەکردنی نێرینەکانیان لە تەمەنی حەوت ساڵییەوە دەستی پێدەکردو تاوەکو تەمەنی بیست ساڵی دەخایەند، ئینجا پەیوەندیان دەکرد بە سوپاو مەشقیان لەسەر جۆرەها ناخۆشی دەکرد تا تەمەنیان دەگەیشتە سی ساڵی، لەپاش ئەوە ئەو کەسە دەبووە هاووڵاتی و مافی هاووڵاتی مافی بوونی پێدەدرا، بەڵام تا تەمەنی شەست ساڵی سزای بەسەردا دەسەپێنرا.

## ب- سیستەمی دیموکراتی:

شاری ئەسینا بە سەرچاوەی دیموکراتیەت دادەنرێ لە مێژووی مرۆڤایەتیدا، بۆ جێبەجێ کردنی ڕژێمی دیموکراتی سەرەتا کۆمەڵێ چاکسازی و یاسای ئەنجامدرا کە بەڕادەیەکی زۆر دەسەڵاتی پاشای کەمکردەوە، هەر لە سەدەی هەشتەمی پ.ز ماوەی دەسەڵاتداریەتی پاشا بە دە ساڵ دیاریکراو، ئینجا لەسەدەی حەوتەمی پ.ز (لە دەوروبەری ساڵی ٦٨٠پ.ز) بووە یەك ساڵ و ئەنجومەنێکیش دانرا بۆ دارشتنی یاسا. چاکسازییەکانی (صولون) یارمەتی پەرەسەندنی دیموکراتی دا کە دەسەڵاتێکی زۆری بە دەوڵەمەندەکان بەخشی، هەروەها دانینابە مافی سیاسی بۆ چینی هەژاران کە بە هەنگاوێکی گەورەی بەرەو پێشەوە چوون دادەنرێ، بۆیە بە صولون دەگوترێ (باوکی دیموکراتیەت)، بەهۆی شەڕەکان و ئەو گۆڕانە کۆمەڵایەتی و ئابووریانەی لە گەڵیدا ڕوویاندا ڕژێمی سیاسیشیان گۆڕانی بەسەر داهات، کلیسپینس هەڵسا بە چەند چاکسازیەك بۆ چاککردنی ڕژێمی سیاسی لە ئەسینا، یاسای ساڵی ٥٠٧پ.ز دەرکرد، بە گوێرەی ئەم یاسایە نوێیە مافی هاووڵاتیبوون بووە مافێکی بۆماوەیی (وراثی)و کۆمەڵەیەکی نیشتمانی لە (٥٠٠) ئەندام پێك هێناو هاووڵاتیان مافی ئەوەیان هەبوو لە نێوان تەمەنی سی ساڵی تاوەکو شەست ساڵیدا دووجار تێیدا ببنە ئەندام.

کۆمەڵە(پەرلەمان) کە بە (ئەکلیزیا) ناسرا لەسەدەی پێنجەمی پ.ز بۆ دیاریکردنی چارەنووسی سیاسی ئەسینا مافی دەست خستنە ناوەوەی هەبوو، و مافی بەستنی هاوپەیمانیەتی پەیمان بەستن و دامەزراندنی باڵیۆزو دەنگدان لەسەر بودجەی دارایی هەبووە، بەگشتی کۆمەڵە دەستی بەسەر دەسەڵاتی یاسادانان و حکومەت (دەسەڵات جێبەجێکردن)داگرتبوو،هەروەهادەسەڵاتی بەسەر دادوەریش دا هەبوو.

## دووەم: ئایینەکان:

ئەغریقییەکان هەروەك دانیشتوانی وڵاتی ڕافیدین(دوو ئاوان) ژمارەیەکی زۆر خوایان پەرستووە، بە بۆچوونی ئەوان خواوەندی زیوس سەرۆکی خواکانی سەروەری ئادەمیزادە، کە ئەویش خەڵکی چیای ئولمپیوسە و خێزانەکەشی (هیرا) ئەویش خواوەند بووە سەرپەرشتی ژیانی ئافرەتانی کردووە خوای دیکەش هەبووە وەك خواوەند ئەپینای کچی زیوس و خواوەند ئەپۆلۆ خوای ڕووناکی لاوان و مۆسیقاو وازهێنان لە گوناح و پاکبوونەوە بوو ناوی بەسترابوو بە ناوی ڕۆژەوە خوشکەکەی کە خواوەند دیانا (ئەرتمیس)بەکارەکانی براکەی هەڵدەستا لەهەمان کاتیشدا لێپرسراوی ئافرەتان بوو، و لە خواوەندەکانی تر خواوەند نبتونوس خوای دەریاو سەرچاوەکان، و خواوەند ئەفرۆدیتس (خواوەندی شەڕو جوانی) و خواوەند باخوس خوای بەرهەم و سەوزایی و خوای شانۆ. ئەغریقییەکان بۆ خواکانیان پەرستگایان دروست کردووە و قوربانی و دیاریان پێشکەش کردووە و پەرستگاکان زەوی کشتوکاڵی و دەرامەت و بەندەی خۆیان هەبووە، دەوڵەت لەڕێگەی پیاوانی ئایینەوە کە ڕاسپێردرابوون بە سازدانی بۆنە ئایینیەکان و چاودێریکردنی جەژنەکان، کاروباری پەرستگاکانی بەڕێوەدەبرد.

## سێیەم: یارییەکانی ئۆلۆمپی:

گرنگترین جەژنە لای ئەغریقییەکان کە بە هاوشێوەی ئاهەنگە ئایینی و نەتەوەیەکان دادەنرێ، جەژنی یارییە ئۆلۆمپییەکان بۆ پەرستنی خوای زیوس دانراوە، پاش نەمانی وەرزی هاوین ئاهەنگ بە بۆنەی نەمانی وەرزی هاوینەوە ساز دەدرێ، لەم ماوەیەدا شەڕ ڕاگرتنی پیرۆز لە هەموو وڵاتی یۆنان ڕادەگەینرێ بۆ ئەوەی زۆرانباز و گەشتیاران و میوانان بتوانن ئامادەی ئاهەنگەکە ببن و بە ساغ و سەلامەتیش بگەڕێنەوە وڵاتەکەیان،

هەرچەنـدە جەژنەکـە تایبەتـە بـە یارییـەکان کەچـی دەرفەتێکـە بـۆ ئـەو کەسـانەی بەرهەمـی ئەدەبـی یاخـود زانسـتیان هەیـە لەنـاو خەڵکیـدا بـڵاوی بکەنـەوە یاخـود وتاربێـژان گوزرشـت لـە بیـرورای خۆیـان بکـەن، هەرچـوار سـاڵی جارێـك ئاهەنگەکـە لـە شـاری ئەلیـس کـە دەکەوێتـە سـەر چیـای ئۆلۆمپیـۆس سـاز دەکـرێ و یەکەمیـن ئاهەنگـی ئۆلۆمپـی لـە سـاڵی ٧٧٦پ.ز بـووە، لـە سـەرەتادا پرۆگرامـی یارییـەکان تەنهـا یـەك ڕۆژ بوو، کـە (دە) دادوەر یاریانـە تیایـدا ئەنجامـدەدرا بریتـی بـووە لـە بازدانـی درێـژ و تیـر هاویشـتن و (قـورس)، لـە کۆتایـی یارییەکانـی زۆرانبـازی و مشـتەکۆڵە و پێشـبرکێی ئەسـپ سـواری، لـە کۆتایـی یارییەکانـی نـاوی سـەرکەوتوو بـراوە و نـاوی شـارەکەی ڕاگەیەنـدراوە و دادوەران سـەرکەوتوەکانیان بـە چەپڵـە و گـەڵای زەیتـون گوڵبـاران کـردووە کاتـی سـەرکەتووەکان گەڕانەتـەوە شـارەکەی خۆیـان بـە گۆرانـی و سـەما و خەڵاتـی مـادی پێـش وازیـان لێکـراوە.

## چوارەم: ژیانی هزری (الحیاة الفکریة):

### أ – وێژە (الأدب):

**١- داسـتان:**

ئەغریقییـەکان بـەوە وەسـف کـراون کـە خاوەنـی هەسـتێکی بـەرزی ئەدەبیـن، چامـەی درێژیـان بـۆ پاڵەوانەکانـی ئەغریـق هۆنیوەتـەوە و کـە بـۆ خواوەنـدی (خـارق) دەگەڕێتـەوە، بەمـەش داسـتانی شـیعری جوانیـان داڕشـتووە کە داسـتان و ئەفسـانە بەیـەك دەبەسـتێتەوە، ئەلیـادە و ئۆدیسـە لـە گرنگتریانـن، ئەلیـادە و ئۆدیسـە بەرهەمـی شـاعیری ناسـراو بـە هۆمیـرۆس کە لـە سـەدەی نۆهەمی پ.ز ژیـاوە، ئەلیـادە وێنەیەکـی ڕاستەقینەو ئاشـکرا لـە بـارەی ژیانـی ئایینـی لـەلای ئەغریقییـەکان بـە دیاردەخـات تاوەکـو بۆتـە پەرتووکێکـی پیـرۆز لەلایـان، هەروەهـا وێنەکـەش لـە بـارەی ژیانـی کۆمەڵایەتـی و ئابـووری لـە سـەدەی دوانـزەی پ.ز یۆنـان پیشـان دەدات، ئەمـەش بەڵگەیـە بـۆ ئەوەی کـە هۆمیرۆس لـە چامـەی ئەلیـادە زانیارییەکانـی لـە شـاعیرانی پێـش خـۆی هەڵێنجـاوە، ئەلیـادە

ئاماژەی داوە بە یەکگرتنی شارەکانی یۆنانی و داگیرکردنی کەناری ڕۆژهەڵات لە گەرووی دەردەنیلەوە کە پێی دەگوترێ (تەروادە) (Troy)، هەروەها کاتێ باسی شەڕی نێوان پاڵەوانی ئەلیادە ئەخلیس و پاڵەوانی تەروادە هیکتۆر دەکات لە هەمان وەسفی چەکی ئەو ڕۆژگارەش دەکات. داستانی (ئۆدیسە)ش بەرهەمی هومیرۆسە، لەم داستانەدا بە شێوەیەکی ئەدەبی و ناسك و دوور لە کوشتار و توند و تیژی باسی ئوودیسیوس دەکات کە یەکێکە لە پاڵەوانەکانی شەڕی تەروادە و بۆ شاری ئەسینا دەگەڕێتەوە، باس لەو ئاستەنگانە دەکات لە ڕێگەی گەڕاندنەوەیدا لە دەریا تووشی دەبێت وەکو تێکشکاندنی کەشتیەکەی و چۆن خواوەند زیوس هاتووەو یارمەتی داوە و ئەو ناخۆشیانەی ژنەکەی لە دووری ئەو تووشی هاتووە.

**٢- ئەدەبی شانۆ:**

ئەغریقییەکان لە کاری درامی ناوبانگیان دەرکردەو نووسینی دەقی شانۆیی بەبەشێك لە ئاهەنگی ئاینی دادەنرا،شانۆگەرییەکان دوو جۆری هەبوو:

## یەکەم تیراژیدی (خەماوی- ناخۆشی):

دەقی شانۆیی لەسەر دەستی یەکێك لە نووسرایەوە ئینجا لە ئاهەنگێکی گەورە پێشکەش دەکرا، لەکاتێ ئەکتەرەکان دەورەکەیان دەنواند مۆسیقای لەگەڵ بەکار دەهێنراو سەمای پیرۆزی لەگەڵ دەکرا، نووسەری دراما هەوڵی داوە بیروڕاکانی گەل و ئارەزووەکانی پێداویستی و هیواکانیان لەسەر رازی ئەکتەرەکان جوڵانەوەیان بەرجەستە بکات، لە بەناوبانگترین نووسەرانی تراژیدیا (ئەیسکلیوس ٥٢٥-٤٥٥) پ.ژ کە دەروونی مرۆڤی لێکداوەتەوەچەندین خەڵاتی بەدەست هێناوە، ڕۆمانە بەناوبانگەکەی ناوی (ئۆدیب)ە، هەروەها (یوربیدز)ی شاعیر (٤٨٠ – ٤٠٦) پ.ز لە بواری تیراژیدیا ناوبانگی دەرکرد، ئەوەشیان لە ژێر کاریگەری فەلسەفەی یۆنانی جەختی لەسەر زانینی دەروونی مرۆڤ کردۆتەوە.

**دووەم کۆمیدی (پێکەنین – گاڵتەکردن):**

بریتیە لە درامایەکی ڕەخنەگرانە وشێوازێکە گاڵتەجاری لەخۆوە گرتووە، ئامانجی کات بەسەربردن و خۆشییە، نووسەرلانی کۆمیدیا ڕەخنەیان لە کەسایەتییەکان و بیروڕای سیاسی و فەلەفەی گرتووە، بەناوبانگترین شاعیری کۆمیدی ئەرسترفانیس(٤٤٥ – ٣٣٨)پ.ز کە یانزە ڕۆمانی کۆمیدی نووسیوە.

**٣- مێژوو:**

نووسینەوەی مێژوو بە شێوەیەکی ڕێك و پێك لەلای ئەغریقییەکان لەسەر دەستی هێرۆدۆتس (٤٨٥ – ٤٢٥) پ.ز سەری هەڵدا، بۆیە مێژوو ناسراوە، هێرۆتس لە یۆنان، سەردانی میسر و ئێران و ئاسیای بچووك و ناوچەکانی دیکەی کردووە، پەرتوکێکی گشتی لەبارەی مێژوو داناوە و بەسەر نۆ بەش دابەشی کردووە، هیرۆدۆتس ناوی لە کارەکەی ناوە هستوریا Historia، بەمانای وشە واتە بەدواداگەڕان (التحریر) هێرۆدۆتس لە پەرتوکەکەی ڕاستی و خەیاڵی تێکەڵ بە یەکتری کردووە، هەڵساوە بە گێڕانەوەی هەواڵی سەیر کە لەگەڵ واقیعیدا ڕێك ناکەوێ و شتێکی باشی لەبارەی میدییەکان نووسیوە.

زەینفۆن (٤٣٠ – ٣٥٤)پ.ز لە پەرتووکی ئەناباسس (بەرەو باکوور) و چۆنیەتی پاشەکشەکردنی (بەکرێگیراوەکان)ی ئەغریق کردووە لە وڵاتی بابل لە گەڕانەوەیان بۆ وڵاتی خۆیان ڕێگەی دۆڵی ڕووباریدیجلەیان بەکارهێناوە وساڵی ٤٠١ پ.ز ب وڵاتی کاردۆخییەکان (کوردستان) تێپەربوون، نووسینەکانی زەینفۆن وردتر واقیعیترن لەو نزمترە، چونکە بەشێوەکی سادە و درێژ نووسراوەتەوە و لەگەڵ زۆری دووبارەبوونەوەدا.

**٤- فەلسەفە:**

زانست و فەلسەفە بران و هەردووکیان زادەی هزرن (الفکر) و لەلای ئەغریقییەکان یەك مانا دەبەخشن، بە واتایەکی دیکە فەیلەسوفەکانیانی ئەغریقی وەکو زانست لەبارەی دیاردە سروشتیەکانیان کۆڵیوەتەوە، بیرمەندانی ئەغریقی (گریکیەکان) هەوڵیانداوە لێکدانەوەیەکی بەجێ ببەخشنە

گـەردوون و جیهانـی مـادی و مـرۆڤ بـەوەی دروسـتکراوە بوونەوەرێکـی (مەخلـوق) خاوەنـی جەسـتە و بیـر و کەسـایەتییە و ئـەو یاسـانەی کـە ڕەفتـاری مـرۆڤ ڕێـك دەخـەن شـیانکردۆتەوە. فەلسـەفەی یۆنانـی بەسـێ قۆناغـدا تێپەڕیـوە کـە ئەوانیـش:

أ- قۆناغـی گـەڕان (بحـث) بـەدوای سروشـت و بنچینـەی گـەردوون، فەیلەسـوفان لـەو (ڕەگـەز) ەکان سروشـتیان کۆڵیوەتـەوە وەکـو (هـەوا، ئـاو، خـاك، ئاگـر) فەیلەسـوفەکانی ئـەو کاتـە (تالیـس و فیسـاگۆرس) بـووە.

ب- قۆناغـی گـەڕان بـەدوای مـرۆڤ و ڕەفتارەکانـی و ڕەوشـت و سیاسـەت، فەیلەسـوفانی ئـەم قۆناغـە سۆفتائیەکان بـوون (گەیشـتنی بـە ڕاسـتی لـە ڕێگـەی دانوستانەوە).

ج- قۆناغـی توێژینـەوەی زانسـتی ڕێکخـراو و دامەزراندنـی قوتابخانـەی فەلسـەفی بەناوبانگتریـن بەناوبانگتریـن فەیلەسـوفەکانی ئـەم قۆناغـە ئەفلاتـون و ئەرسـتۆ.

## سۆکرات (Socrats) (٤٧٠ – ٣٩٩) پ.ز:

خەڵکـی ئەسـینایە و بیـروڕا و بۆچوونەکانـی نەنووسـیوەتەوە، بەڵکولـە ڕێگـەی ئەفلاتوونـی قوتابیەکـەوە بـە ئێمـە گەیشـتوون، سـۆکرات ئامـاژەی بـەوەداوە کـە کاری بنەڕەتـی فەلسـەفە لێکۆڵینەوەیەتـی لـە بـارەی مـرۆڤ ئـەوەی پێیـەوە پەیوەسـتە، و دروشـمی (خـۆت بناسـە)ی بەرزکردۆتـەوە.

سـۆکرات بـڕوای وابـوو مەبەسـت لـە بوونـی ئادەمیـزاد ئەوەیـە دەستەبەرکردنی بەختیـاری کـە دەتوانـرێ لـە ڕێگـەی پەیوەسـتبوون بـە چاکەکانی وەکـو دانایی و ئازایەتـی و دادپـەروەری و ڕاسـتگۆیی و دەسـتپاکی و هاوڕرێیەتـی دڵسـۆز بـەدی بهێنرێـت، سـۆکرات (جەختـی) لەسـەر هـۆش کردۆتـەوە لـە درك کـردن و هەسـتکردن بـە شـتەکان، پارێـزگارەکان (المحافظـون) سـۆکراتیان بـەوە گوناهبـار کـردوە کـە مێشـکی لاوانـی ئەسـینای تێکـداوە و بڕیـاری کوشـتنیان بەسـەر داوە، و هەرچەنـدە دەیتوانـی ڕابـکات، کەچـی وەکـو ڕێزگرتنێـك لـە یاسـای ئەسـینا ژەهرەکـەی خـواردووە.

## ئەفلاتوون (Plato ٤٣٧ - ٣٤٧) پ.ز

لە ئەسینا ژیاوە و قوتابی ژێر دەستی سۆکرات بووە و لە ئەسینا خوێندنگەی بەناوی (ئەکادیمی) دامەزراندووە، کە تێیدا وانەی بە قوتابیەکان گوتووە، بۆچوونەکانی سۆکراتی نووسیوەتەوە و تەوەرەکانی لەبارەی فەلسەفەی گەردوون و ئەندامەکانی لەشی مرۆڤ و پیریەتی تێدا نووسیوە، هەوڵە فەلسەفییەکانی بە دانانی پەرتووك لەمەڕ سیاسەت بە ئەنجام گەیشت ناوی نا (کۆمار)، کە بڕوای وایە باشترین ڕژێمی دەسەڵاتداریەتی ئەوەیە کە فەیلەسوفەکان دەوڵەت بەڕێوەدەبەن، یاخود ئەوەی ئێستا پێی دەگوترێ بنەما ڕەگەز تەکنۆکراتی.

## ئەرستۆ: Arstotie (٣٨٤- ٣٢٢)پ.ز:

لە باکووری یۆنان لە دایك و لەکاتی لاویدا پەیوەندی بە ئەکادیمیای ئەفلاتوون کردوە، و بۆ ماوەی بیست بووە بە مامۆستاکەی، و پاش ئەوەی لە ساڵی ٣٤٢ پ.ز چووتە مەگدۆنیا، بۆ ئەوەی سەرپەرشتی پەروەردەکردنی کوڕی فیلیب پاشا ئەسکەندەری مەکدۆنی بکات، ئینجا گەڕاوەتەوە ئەسینا و خوێندنگەیەکی بەناوی (لوسیوم) دامەزراندوە، ئەرستۆ پەرتووکێکی لەبارەی سروشتەوە نووسیوە و پەرتووکێکی لەبارەی ڕەوشتەوە داناوە کەتێیدا باسی لە چاکە کردووە و پەرتوکێکی داناوە کە تێیدا باس لەبارەی لە رژێمێکی نموونەی بۆ دەوڵەت کردووە و پەرتووکێکی دیکەشی بەناوی جوانی هەیە و چەندین و تاری لەبارەی ژیانزانی نووسیوە، لەبەر ئەوەی ئەرستۆ بنچینەی بۆ چەندین زانست داناوە، بۆیە پێی دەگوترێ مامۆستای یەکەم، جیا لە دانراوەکانی پێشووی بنەمای زانستی لۆژیك (علم المنطق) (هونەری بیرکردنەوەی ڕاست) و بنەمای شێوازی بیرکردنەوەی زانستی دروستی داڕشتووە.

## پرسیارەکانی بەشی چوارەم

پ١/ کاریگەری جوگرافیەی یۆنان لەسەر شارستانیەکەی ڕوون بکەوە.

پ٢/ باسی سەرهەڵدانی ڕژێمی دیموکراتی بکە لە ئەسینا.

پ٣/ چۆن یاریە ئۆڵۆمپیەکان سەریان هەڵدا؟ گرنگییەکەی چییە؟

پ٤/ ئەم دەستەواژەیە لێك بدەوە (( ئەرستۆ بە مامۆستای یەکەم دادەنرێ)).

## سەرچاوەکانی بەشی چوارەم


١- بتری أ،مدخل الی تأریخ الاغریق و أدبهم وأثارهم، ترجمة ئيل يوسف عزيز(الموصل،١٩٧٧).

٢- طه باقر، مقدمه في تأريخ الحضارات القديمة، ط٢، (بغداد،١٩٥٦)

٣- عادل نجم عبود المنعم رشاد، اليونان و الرومان، دراسة في تأريخ و الحضارات، دار الكتب للطباعة و النشر، (الموصل).

٤- لطفي عبدالوهاب يحيي، اليونان مقدمة التأريخ الحضاري، (بيروت، ١٩٧٩).

# بەشی پێنجەم



## شارستانییەتی ڕۆمانی

### پێشەکی:

ڕۆمانەکان شارستانییەتی و شێوازی ژیانی ئەغریقیەکانیان وەرگرتووە، بۆیە تۆژەرانی شارستانییەکان بەتایبەتی تۆژەرانی ویژە هەردوو شارستانیەکە بە چەرخی کلاسیکی ناودەبەن، ڕۆمانییەکان گرنگی زۆریان بە فەلسەفە نەداوە، بەڵکو زیاتر بابەخیان بە یاسادانان و یاساکان و شێوازی کارگێڕی و ڕێکخستنە سەربازیەکان و ڕێگەکانی گواستنەوەو بیناسازی داوە؟

### یەکەم یاسای ڕۆمانی:

یەکێکە لە بەناوبانگترین دەستکەوتە شارستانیەکان و گرینگترین شتە کە پێشکەش بە مرۆڤایەتیان کردوە، ڕۆمانەکان پەرەیان بە یاساکانی (شرائع) یۆنانیەکان داوە و زۆریان خستۆتە سەری، تاوەکو لەسەردەمی جستنیان (٥٢٧ – ٥٦٥)ز ئیمپراتۆری بیزەنتینی گەیشتۆتە ئاستێکی پێگەیشتن. لە نیوەی دووەمی سەدەی پێجەمی پ.ز لەلایەن لێژنەیەکی یاسایی توانرا کۆمەڵێك یاسای باوی ڕۆمانی بنووسرێتەوە و ئەم یاسایە بە دوانزە تابڵۆ بە ناوبانگەکە ناسراوە، ئەم یاسایە لەسەر دوانزە تابلۆی برونزی تۆمار کراوە و لە شاری ڕۆمای پایتەخت پیشان داوە، یاسا ڕۆمانی کۆن بریتییە لە یاسایەکی شارستانی (مدنی) هیچ پەیوەندیەکی بە ئایینەوە نییە، لەسەر ئەوانەشەوە بڕیارەکانی ئەنجومەنی پیران و بڕیارەکانی دەستەکانی یاسادانان و ئەو فەرمانانەش کە پاشەکان دەریانکردوە کە بوونەتە یاسای ئەم وڵاتە.

**ڕۆمانەکانی سێ جۆر یاسایان لەیەك جیاکردۆتەوە ئەوانیش:**

**أ- یاسای شارستانی (مدنی):** کە لەسەر ڕۆمانەکان یاخود ئەو کەسانەی سیفەتی هاوولاتیاتیبوونیان هەیە ئەوانیش دانیشتوانی ئیتالیا و ڕۆژئاوای ئەورووپا و یۆنان دەگرێتەوە.

**ب- یاسای گەلان:** ئەم یاسایە لەو هەرێمانە جێ بەجێ کراوە کەسەر بە ئیمپراتۆریەتی بوون لە ئاسیا و ئەفریقادا، بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار یاسای گەلان کاری کردە سەر یاسای شارستانی ڕۆمانی و ڕێبازەکەی.

**ج- یاسای سروشتی:** بریتییە لەو یاسایەی کەسەر بە هەموو بوونەوەرە زیندووەکان دەسەپێ، ئەم یاسایە گرنگی داوە بە سروشتی پەیوەندییەکان و پەیوەستە کۆمەلایەتییەکان.

دادوەران ئەم یاسایان لە دادگاکانی ڕۆمانی جێ بەجێ کردوە، کاری پێوەیستیان کردووە بۆ ڕێکخستنی داواکاریە شارستانیەکان بە پشتبەستن بە نەریتە یاساییە باوەکان لەوانە چوونی داواکار بۆ دادگە و پێشکەشکردنی سکالا (شکات) دژ بە داوالێکراو، دادگاش بەدوای بەڵگە تاوانکاریدا گەڕاوە و پاش سەپانی تاوان بەسەر داوالێکراو، بە گوناهبار دادەنراو ئینجاو دادوەر بە پشتبەست بەیاسای بڕیاری خۆی لەسەر دەدا.

**د- یاسای جستیان:** ئیمپراتۆری بیزەنتی فەرمانیدا بە پێکهێنانی لێژنەیەك لە یاساناسان، داوای لێکردن پاشای کۆکردنەوە زیادکردنی ئەو یاسا نوێیانەی کە لەلایەن ئیمپراتۆرەکانی دەرچووە بخرێتە سەر یاساکانی پێشوو و لێکۆڵینەوە لە بارەی یاسای ڕۆمانی بکەن، پاشان ئەوەی لێژنەکە کارەکەی تەواو کرد، لە ساڵی ٥٣٣ ز بۆ یاسای ڕۆمانی دەرچوو، ئەو هەوڵەی یاساناسانی (الفقە) ڕۆمان ناوی ئیمپراتۆری جستنیان نەمر کردوو ئەو دەستکەوت و کۆششەی یاسا ناسان دایان هەمووی درانەپاڵ ئیمپراتۆر، مێژوونووسان بە کارێکی گەورەیان لەقەڵەم دا، چونکە یاسای ڕۆمانی لەناوچوون پاراست.

ئنسكلۆپیدیای یاسای ڕۆمانی لە چەند بەشێك پێكدێت و هەر بەشێكی بۆ چەند بابەتێكی یاسایی دابەشكراوەو، ئەو بابەتانەش بەسەر چەند بەندێك دابەشكراوەو، لێژنەكە پەرتووكێكی دانا ناوی نا پەرتووكی ڕێكخستن (النظم) و كە بریتییە لە پەرتوكێكی قوتابخانە و بنەماكانی یاسای ڕۆمانی تێدا دانراوە.

لەساڵی **٥٣٣** زاینی جستنیان فەرمانێكی دەركرد بڕیاردا بە جێبەجێ كردنی ئەو یاسای نوێیە، یاساكە لەو ناوچانەی كە لە ژێر دەسەڵاتی خۆی بوون ڕێرەوی خۆی وەرگرت و دوای دەسەڵاتی خۆشی ئیمپراتۆرەكانی دیكە لەسەر ئەو یاسایە ڕۆیشتن و، لەبەر ئەوەی یاساكەی جستنیان گرنگ بوو بۆ سەر زۆربەی زمانە بەناوبانگەكانی جیهان وەرگێڕدراوە، لەوانیش زمانی عەرەبی، بۆتە سەرچاوەیەك بۆ یاساكان و دەستووری وڵاتانی پێشكەوتووی جیهان، ئەو قوتابیە خۆشەویستانەی كە لە بواری لێكۆڵینەوەی یاسایی پسپۆری پەیدادەكەن، دەتوانن بە شێوەیەكی ئاشكرا لێكۆڵینەوەی یاسایی پسپۆری پەیدادەكەن، دەتوانن بە شێوەیەكی ئاشكرا كاریگەری یاسای ڕۆمانی لەسەر یاسای فەڕەنسی و ئینگلیزی و دەستووری وڵاتەیەكگرتووەكانی ئەمەریكا ببینێ، لەبەر ئەوە یاسای ڕۆمانی بۆتە بابەتێكی بنەڕەتی لە كۆلیژی یاسا لە هەموو زانكوكانی جیهان قوتابیان دەیخوێنن.

## دووەم: بیناسازی:

بیناکانی ڕۆمانی بەهێزی و گەورەیی ناسراون، ئەویش بەهۆی بەکارهێنانی بەردو کەلوپەلی کۆنکرێتی لە دروستکردنیاندا، بۆیە پاشماوەی زۆربەی کارە بیناسازیەکانیان لە ئیتالْیا و سوریا و لیبیا و ئەو ناوچانەی کە لە ژێر دەسەڵاتی سەروەری ڕۆمانیدا بوون ماون، ڕۆمانەکان لە کارە بیناسازیەکاندا سیستەمی گومەز (قبوات) و تاق (العقود) و شێوازی کەوانەیین لە بنمیچی (تسقیف) قەڵاو پردو دروستکردندا بەکارهێناوە و کەڵکیان لە بەستنی نیو بازنەیی بینیوە لە بەنیادی (پردەکان) ئامادەکردنی ئاوو بەکارهێنانی مەڕمەڕ لە داپۆشینی زەوی و خانووبەرە و دیوارەکانیدا، جگەلە (کەوانە و گومەز) بیناکانیان بە ستوونی گەورە ڕاگیراون. ڕۆمانیەکان تەلاری گەورەیان بۆونیاد ناوە پێی دەگوتریّ فۆروم (Forum) بریتیە لە بینایەکی گشتی وەکو بازاڕ وشوێنی گرێدانی کۆبوونەوەی گشتی و چالاکی وەرزشی، بەناوبانگترینیانریگای ئیمپراتۆر تراجان کە لە شاری ڕۆما دروستی کردووە. ڕۆمانەکان پەرستگای گەورەیان دروستکردووە کەلەسەر ستوونی گەورە دامەزراون و هەندێکیانڕاستن، هەروەها شانۆ و گەرماویان بوونیاد ناوە، شانۆی کالیسۆم لە ڕۆما بە بەناوبانگترین شانۆ دادەنریّ، کاریگەری بیناسازی ڕۆمانی بۆ زۆربەی لایەنەکانی جیهانی شارستانییەتی گواستراوەتەوە بە تایبەتی لە بونیادی قناگر (ئاوەڕۆ) و پرد لەسەر ئاو دروستکردنی، هەروەها دروستکردنی کۆشك وپەرستگادا، بەگشتی بەکارهێنانی (کەوانە، تاق) لە خانوودا کاریگەری ڕۆمانیەکان بووە.

## پرسیارەکانی بەشی پێنجەم

پ١/ ڕۆمانەکان لاسایی شارستانییەتی ئەغریقییەکانیان کردۆتەوە، هۆی ئەمە چی بوو.

پ٢/ پەیوەندی جستنیانی ئیمپراتۆر بە یاسای ڕۆمانیەوە چی بوو؟

پ٣/ ئەم دەستەواژەیە لێك بدەوە: ڕۆمانەکان لە ڕووی بیناسازیەوە لە ئەغریقییەکان پێشکەوتووتر بوون.

## سەرچاوەکانی بەشی پێنجەم


١- بتـرى أمدخل الـى تأريـخ الاغريـق و أدبهـم وأثارهـم، ترجمـة ئيل يوسـف عزيـز (الموصل، ١٩٧٧)

٢- طه باقر، مقدمه في تأريخ الحضارات القديمة، ط٢، (بغداد،١٩٥٦)

٣- عـادل نجـم عبودالمنعـم رشـاد، اليونـان و الرومـان، دراسـة فـي تأريـخ و الحضـارات، دار الكتـب للطباعـة و النشـر، (الموصـل).

٤- لطفـي عبدالوهـاب يحيـي، اليونـان مقدمـة التأريـخ الحضـاري، (بيـروت، ١٩٧٩).

# بەشی شەشەم




## یەکەم عیلامییەکان:

عیلامییەکان لە باشووری رۆژئاوای ئێران نیشتەجێبوون، ئەو هەرێمە (دەڤەر)ەی لێی نیشتەجێ (گیرسانەوە) بوون خۆزستان یان (ئەهواز) پێ دەووترێت، پاشان بەرەو باکوورکشان (رۆیشتن) بۆ ناوچەی چیاکانی (بەختیاری) تاوەکو سنووری لورستان.

سۆمەرییەکان بە ولاتی عیلامییەکانیان دەگوت (نم: NIM) بە واتای زەوییە بەرزەکان یاخود (دەڤەر بانەکان). عیلامییەکان چەندین نێوەندی شارستانیان دامەزراند، لە هەموویان گرنگتر شاری شوشیانا (سوسە) لە باشوور و شارەکانی (ئەنشان و ئاوان) لە باکوور.

عیلامییەکان سوودیان لە شارستانی سۆمەرییەکان وەرگرت و پەرەیان بە رووخسارەکانیان دا بەو شێوازەی کە لەگەڵیاندا دەگونجێت، هەروەها عیلامییەکان لە رووداوەکانی ولاتی دووئاوان (دۆڵی رافیدەین) دا بەشداریان کردووە بەهۆی کاری دراوسێ بوون، دوای ئەوەی ولاتەکەیان رووبەرووی شالاو و هێرشی پاشا ئەکەدییەکان و پاشاکانی بنەماڵەی ئوری سێیەم بووەوە، لە سالانی (٢٠٠٤پ.ز) شاری (ئور) یان داگیر کردو تالانیان کرد حوکمی پاشاکانی بنەماڵەی ئوری سێیەمیان لەناوبرد، پاشان کۆتاییان بە حوکمڕانی (کاشییەکان) هێنا، هەروەها ولاتی بابلیان لە ساڵی (١١٦١ پ.ز) بە تالان بردو لە نێوان دەسکەوتەکانی ئەم هێرشانە ئەو کێڵە (میله-المسله) بوو یاساکانی (حامورابی) لەسەر نووسرابوو، دواتر لە ساڵی ١٩٠١ز) لە شاری (سوسە) دۆزرایەوە.

عیلامییەکان نووسینی بزماریان بەکارهێناوە و ئاماژەکانیان کورت کردۆتەوە، تاوەکو لەگەڵ زمانی خۆیان بۆ نووسین بگونجێت. ئایینی عیلامییەکان لەگەڵ ئایینی دانیشتوانی وڵاتی دوو ئاو (دۆڵی رافیدەین) زۆر جیاواز نەبوو، چەندین خواوەندیان دەپەرست لەوانە خواوەندی (خومبان) کە خواوەندی ئاسمان بوو، هەروەها خواوەندی (خوتران) و خواوەندی (ئەنشوشینال) کە خواوەندی شاری (سوسە) بوو، پەیکەری ئەم خواوەندیان لە پەرستگای سەرەکی شارەکە دانابوو.

وڵاتی عیلامییەکان ڕووبەڕووی شاڵاوی دەوڵەتی ئاشوورییەکان بووەوە، سوپای ئاشوورییەکان (سوسە)ی پایتەختی عیلامییەکانیان داگیرکرد و وێرانیان کرد کۆشك و تەلار پەرستگاکانیان تاڵان کردو بەمەش دەوڵەتی عیلامییەکان کۆتایی پێهات.

## دووەم: دەوڵەتی ئەخمینی (٥٥٩-٣٣١پ.ز)

شا کۆرشی دووەم توانی دەوڵەتی (ئەخمینیەکان) دابمەزرێنێ و ئەم ناوەش لە ناوی باپیرەی ئەم بنەماڵەیە وەرگیراوەن کە ناوی (ئەخمینۆس) بووە. کۆرش توانی دەست بەسەر وڵاتی فارس و میدیا و هەرێمەکانی تری ئێراندا بگرێت، هەروەها توانی دەست وڵاتی بابل داگیر بکات، بەمەش بنەماکانی دەوڵەتی دانا. پاشان ئەوانەی ئەو هاتن سنووری دەوڵەتی ئەخمینیەکانی فراوان کردو وڵاتی ئەنادۆڵ وڵاتی شام و میسریان خستە ناو دەوڵەتەکەیان پەڕینەوە بەرەو ئەورووپا شارە یۆنانیەکانیشیان خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیان، ئەمەش دەرگای ململانێ یەکی دوورودرێژە خستە سەر پشت لە نێوان فارس و یۆنانیەکان، کە لە مێژوودا بە جەنگەکانی (فارس و یۆنان) ناسراوەو کە لە دوواییدا (ئەسکەندەری مەقدۆنی) ڕۆژهەڵاتی داگیر کرد جەنگەکانی نێوان (فارس و ڕۆمان) بەرپابوو، ئەم جەنگانەش کە پچڕپچڕ بوو ماوەی (١٠٠٠) ساڵی خایاند.

## گرینگترین ڕووخساره شارستانیەکانی سەردەمی ئەخمینییەکان:

### أ-ئایین:

فارسـەکان خواوەندێکیـان دەپەرسـت کـە هێـزی سروشـتی دەخستە ڕوو،وەك خواوەنـدی (میپـرا) کـە خواوەنـدی (خۆر) بـوو، هەروەهـا خواوەنـدی (ئاتـار) کـە خواوەنـدی ئەناهیتـا (عەشـتار) کـە خواوەنـدی بـە پیتـی و بەرهەمهێنـان بـوو. ئاگرپەرسـتان (پیـاوە ئایینـە فارسـەکان) ڕۆڵێکـی دیـاری گرنگیـان هەبـووە لـە کۆمەڵگـە و سەرپەرشـتی بەڕێوەبردنـی ئاهەنگـە ئایینیەکانیـان دەکـرد و شـوێن و پلـە و پایـەی بەرزیـان هەبـوو لـە نـاو خەڵکیـدا.

شـای ئەخمینـی (دارای یەکـەم) ئایینـی (زەردەشـتی) کـردە ئایینـی ڕەسـمی دەوڵـەت. شـاکانی ئەخمینیـەکان هەوڵیـان دا ئـەم ئایینـە بکەنـە هۆکارێـك بـۆ یەکگرتنـی گەلانـی ئیمپڕاتۆریەتەکانیـان یاخـود لەیەکتـر نزیکیـان بکەنـەوە.

هەروەهـا لـە بـواری بیروبـاوەڕی ئایینیـدا بـواری ئازادیـان بـە خەڵکـدا. لـە بەرامبـەر خواوەنـدی (ئەهـورا مـەزدا)ی زەردەشـتی دا، چەندیـن خواوەنـدی دیکـە دەپەرسـترا پاشـا ئەخمینیـەکان چەندیـن پەرسـتگایان دامەزراندبـوو لـە شـارەکانی (بلـخ) و (بـازرگادە) و (برسـیبۆلیس).

### ب- کارگێڕی:

شـاکانی ئەخمینیـەکان شـێوازی کارگێـڕی (لامەرکـەزی) یـان پەیـڕەو دەکـرد، ئیمپراتۆریەتەکەیـان دابـەش کردبـوو سـەر (بیسـت) هەرێمـی جیاجیـا، هـەر هەرێمێـك لـە لایـەن فەرمانڕەوایەکـی فارسـی بـە نێـوی (سـتراب) بەڕێـوە دەچـوو کـە ئـەو بەرپـرس بـوو لـە کۆکردنەوەی بـاج و چەسپاندنی دەسـەڵاتی دەوڵـەت لـەو هەرێمـەی کەتیـادا حوکمـڕان بـوو بـۆ ئـەوەی پایتەختەکەیـان بـە هەرێمەکانـی تـر ببەسـتنەوە.

ئەخمینیـەکان پۆسـتەیان دامەزرانـدو گرینگیـان بـە ڕێگاکانـی هاتووچـۆ داوەو لـە ڕێگاکانـدا وێسـتگەی پۆسـتەیان دامەزرانـدووە لێـرەدا سـوار ئەسـپەکان پۆسـتەکانیان دەگۆڕیـەوە تاوەکـو بڕیـار و فرمانـەکان و نووسـراوەکانی شـا

بگەیننە حوکمڕانی هەرێمەکان.
نێوەندی (بنکەی) کارگێڕی سەرەکی لە پایتەختدا و لە کۆشکی پاشا بوو. پاشا (کۆرشی دووەم) لەسەرەتا حوکمڕانیەتی خۆیدا شاری (ئەکبتانە)ی کردبووە پایتەختی دەوڵەتەکەی، پاشان شاری (بازرگادە)ی دامەزراند لە هەرێمی فارس کە لە نزیك (مەشهەدی مرغاب)ە. تا ئێستاش پاش ماوەی شوێنەواری پایەکانی پەرستگاو کۆشکەکان لەو شوێنەدا ماوە. دوای ئەوەی دەسەڵات کەوتە دەست شا (دارای یەکەم) پایتەختێکی دیکەی دامەزراند، ئەویش لە شاری (برسیبولیس) (تەختی جەمشید) لە نزیك بازرگادە. لەوێدا پەرستگاو کۆشکی بونیادنابوو بە پایتەختی دەوڵەت، شاکانی ئەخمینیەکان بەهرەدارو هونەرمەند بوون لە دروستکردنی کۆشکەکان و ڕازاندنەوەیان لە ژیانی ڕابوردن و خۆشگوزەرانی ژیان.

## ج- بواری ڕۆشنبیری:

ئەخمینییەکان لە نووسیندا خەتی (ڕێنووسی) ئارامیان بەکار هێناوە و زمانی ئارامیش دەنووسرا. دوای ئەوەی دەقی نووسراو لە لایەن شا (دارای یەکەم) لەسەر چیای (بێستون) لە نزیك (کرمەنشا لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان) گفتوگۆی لەسەر کرا ئەمەش بە دەقە گرنگەکان دادەنرێت کە بەزمانی فارسی و ئەکەدی و عیلامی نووسراوە، ئەم دەقە نووسراوە هێما ئاماژەی شیکردنەوەی خەتی مسماری لەلایەن توێژەرو لێکۆڵەرەوە لە سەدەی نۆزدەهەمدا. لێکۆڵەرەوەکان دوای ئەوە لە دەقە فارسیەکاندا دەچوونەوە و دەیان خوێندنەوە پاشان لە نێوان وشەکانی و ئاماژەو هێما مسماریەکان بەراوردیان دەکرد، پاشان چەندین دەنگ و ئاماژەی نووسینی بزماریان دانا لەگەڵ بەراورد کردن لەگەڵ دەقەکانی دیکەدا، لێکۆڵەرەوان چەند بنەمایەکیان دانا بۆ شیکردنەوەی نووسینی مسماری لەو هەوڵانەیاندا سەرکەوتوو بوون.

## سێیەم :شارستانییەتی هیلنیستی:

دوای ڕووخانی دەوڵەتی ئەخمینی لەسەر دەستی (ئەسکەندەری مەکدۆنی) ئەمەش دوای ئەوە هێرشە گەورەی بۆ سەر ڕۆژهەڵات هێنای توانی بەسەر پاشای فارسەکان (دارای سێیەم) سەرکەوتوو بێت لە ساڵانی (٣٣٣ – ٣٣١ پ.ز) هەروەها توانی وڵاتی شام و میسریش داگیر بکات، پاشان ڕووی کرد وڵاتی دۆڵی دوو ئاوان (عێراق) لەوێش سەرکەوتنی کۆتاییان بەسەر شای فارسەکان لە شەڕی ئەربیلا (گۆگامیلا) نزیك شاری (هەولێر) بەدەست هێناو پاشان ڕووی کردە (برسیبولس)ی پایتەخت و داگیری کرد.

ئەسکەندەری مەکدۆنی لە شاری بابل لە ساڵی (٣٢٣ پ.ز) کۆچی دوایی کرد. ئیمبراتۆریەکەی لە نێوان سەرکردەکانی سوپا دابەشکراو پاشان (عێراق و سوریا و ئێران و کوردستان) بوو بەبەشی (سلوقس) کە دەوڵەتی (سلۆقی) لە ساڵانی (٣١١ – ١٢٦ پ.ز) دامەزراند، هەرچی میسرە بوو بەشی (بەتلیموس) کە دەوڵەتی (بەتالسەی) لەوێدا دامەزراند، بەڵام (ئەنتیخونوس) بو بەسەرکردەی ناوچەکانی مەکدۆنیا و ئاسیای بچووك و یۆنان.

سلوقیەکان بایەخیان دا بە بازرگانی و ڕێکخستنی کاروباری دارایی، هەروەها بایەخیان بە سکەلێدانی پارەو کاری پارە گۆڕینەوەدا. هەوڵیاندا ڕێگای ئاوریشم لە نێوان چین و دەریای ناوەڕاست بپارێزن، ئەمەش بە دانانی (بنکە سەربازی) و دروستکردنی قەڵای سەربازی  بە درێژایی ئەو ڕێگا وشکانییە دوورو درێژە.

دەسەڵاتی سلوقیەکان لە ئێران و کوردستان زۆر بەهێز نەبوو، فەرپیهکان توانیان دەوڵەتی خۆیان لە هەرێمی بارپیا (خراسان)ی ڕۆژهەڵاتی ئێران دابمەزرێنن. لە ساڵی (٢٤٧پ.ز) کەوتنە ململانیەکی سەربازی لەگەڵ سلۆقیەکان و دەسەڵاتی سلۆقیەکان کەم بووەوەو پاشەکشەیان کرد بۆ وڵاتی بابل بۆ شاری سلوقسی پایتەختیان کە دەکەوێتە کەناری ڕۆژئاوای

ڕووبـاری دیجلـه لـه باشـووری شـاری (بەغـداد)ی ئێسـتا کـه پاشـماوەکەی بـه (گـردی عومـەر) ناسـراوە. لـه سـوریا بنکەیـان شـاری (ئەنتاکیـه) بـوو.
شارسـتانی یۆنانیـەکان (هیلینـی) لەگـەڵ شارسـتانی ڕۆژهـەڵات تێکـەڵ بـوو لەسـەردەمی سـلۆقیەکان و سـەردەمی فەرپیـەکان کـە دوای ئـەوان هاتـن و شارسـتانییەتی نـوێ دروسـت بـوو، کـه توێـژەران نـاوی (شارسـتانی هێلنسـتی) یـان لێنـا. گەلانـی ڕۆژهـەڵات ڕوخسـارەکانی شارسـتانییەتی (هیلینییەکانیـان) وەرگـرت لـە بـوارەکان ئـەدەب و هونـەر و فەلسـەفەدا، هەروەهـا زمانـی یۆنانـی بڵاوبـۆوە بەتایبەتـی لـەو شـارانەی کـە سـلۆقیەکان لـە (ئێـران و عێـراق و سـوریا و کوردسـتان) دایانمەزراندبـوو، هەروەهـا تێکەڵبوونـی دانیشـتوان لـە ڕووی کۆمەڵایەتـی و ژنخوازیـەوە، شارسـتانییەتی ڕۆژهـەڵات بەتایبەتـی لـە بـواری هونـەردا.



وێنەی ئەسکەندەری مەکدۆنی لە یەکێك لە شەڕەکانی

## چوارەم:

## دەوڵەتی فەرثییەکان (٢٤٧پ.ز- ٢٢٦ز) (پارثەکان)

ناوی ئەم دەوڵەتە لە هەرێمی بارپیا (خراسان) لە رۆژهەڵات ئێران وەرگیراوە و بە دەوڵەتی (ئەشكانی) یش ناسرابوو، چونكە سەركردەی فارسی (ئارشاك) ئەم دەوڵەتەی دامەزراند، پاشان بە دەوڵەتی (ئەشكانی) ناوبرا، بەنێوی خێڵەكانی (ئەسكیثی) كە لە هەرێمی خۆراسان نیشتەجێ بوون و هێزێكی یەكگرتووی سەربازیان پێك هێناو ئەمەش هاوكاریان بە دەوڵەت ڕزگاربوون لە دەسەڵاتی سلۆقیەكان. هەروەها بە دەوڵەتی (فەرثیەكان – پارثەكان)، شاكانیان ناوچەكانی ژێر دەستی خۆیان دەسەڵاتی فیدراڵیان پێدابوو، بۆیە چەندین وڵاتی بچووك دروست بوو كە سەر بە شای (فەرثیەكان) بوو.لەوانە دەوڵەتی ئەیابین (حدیاب) لە نێوان هەردوو زێی گەورە بچووك كە پایتەختەكەیان شاری (ئەربل) بوو لەوانە دەوڵەتی (خضر) (حەزرەمی) ئارامی و دەوڵەتی كەرخینیا (میسان) لە زۆنگاوی حەوێزە.

شاكانی (پارثەكان) زۆر بایەخیان بە ئاوەدانەی و بیناسازی داوە، شارە كۆنەكانیان سەر لەنوێ بنیات نایەوە و پایتەختێكی نوێیان دامەزراند لە باشووری شاری بەغدا لەسەر ڕووباری دیجلە بەناوی ئەیسەفۆن (المدائن) كە ئێستا (سەلمان پاك)ی پێ دەوترێت، هەروەها بایەخیان بە بازرگانی داو، ڕێگاكانی گواستنەوەیان پەرەپێدانی و چەندین حەسار (خان) لە ڕێگاكانی گواستنەوە بۆ پشوودانی بازرگانەكان بنیاتنا و بیری ئاویان هەڵكەند لە ناوچە بیانییەكان تا ناوچە سنوورییەكان وای لێهات بووە هۆی پەیداكردنی دەرامەتێكی زۆر بۆ دەوڵەت، فەرثییەكان هانی جموجۆڵی تری ئابوورییان دا، لەوانە كشتوكاڵ چەندین بەروبوومی كشتوكاڵ نوێیان هێنایە وڵات وەك (قامیشی شەكر و بەخێوكردنی كرمی ئاوریشم) بۆ بەرهەمهێنانی ئاوریشمی سروشتی.

سوپا و سەرکردارییەتی سوپا جێگای بایەخ و شوێنی لە پێشەوەی هەبوو لای شاکانی (پارثەکان)، چونکە دەوڵەت لە حاڵەتی جەنگ دابوو لەگەڵ سلوقیەکان و ڕۆمانەکان. هەر لەسەدەی یەکەمی پ.ز سەرەتای لاپەڕەیەکی نوێ لە شەڕی خوێناوی لەگەڵ ڕۆمانەکان دەستی پێکرد بۆ دەست بەسەرداگرتنی ڕێگا بازرگانییەکان لە کوردستان بەتایبەتی شارەکانی (نەسیبەین و خەران و شەنگال) بە شێیەکی گشتی ڕووباری فورات سنووری نێوان هەردوو وڵات بوو. ڕۆمانەکان بە مەبەستی ڕووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ پارثیەکان وەك لە باکووری کوردستان و هی ترکە ناویان لێنابوو (کوردئێن) و بنکەکەی شاری ئامەد (دیاربەکری ئێستا) بوو، بەمەش کوردستان لە نێو فارسەکان و ڕۆمەکان ئەوکات دابەشکرابوو واتەلە سەدەی یەکەمی پ.ز هەروەها هەرێمەکانی میدیا و هەرێمی ئەدیابین سەر بە فەرثیەکان بوو، بەلام ناوچەی (کوردئین) سەر بە ڕۆمانەکان بوو. کوردستان ببووە گۆڕەپانی (مەیدانی) شەڕی نێوان ئەم دوو دەوڵەتە، لەبەر ئەمەش خەڵکەکەی دووچاری ماڵ وێرانی و مەرگەساتی ئەو شەڕە نیمچە بەردەوامە ببوون، بە تایبەتی کوردەکانی ناوچەی جەزیرە ئەو شەڕە نیمچە بەردەوامە ببون، بەتایبەتی کوردەکانی ناوچەی جەزیرە ئەوە بوو حارێکیان ڕۆمانەکان گەیشتنە شاری (هەولێر) و داگیریان کرد، بۆیە سەردەمی حوکمرانی (بارثەکان) بە سەردەمێکی تاریك لە مێژووی گەلی کورد دادەنرێت، خاکەکەی ئەوکات دابەش کرابوو خەڵکەکەشی تووشی ماڵوێرانی جەنگ و وێرانکاری کۆچپێکردنی خەڵك و بلاوبوونەوەی نەخۆشی و برسێتی بوون.

## پێنجەم: دەوڵەتی ساسانییەکان (٢٢٦ – ٦٥١ز)

شا ئەردەشیر کوڕی بابك کوڕی ساسان ئەم دەوڵەتەی دامەزراند، بۆیە ناونرا دەوڵەتی ساسانی بەناوی باپیری کەلە خزمەت پەرستگای سەرەکی زەردەشتی لە شاری ئەستەخر لە هەرێمی فارس کاری دەکرد، ئەردەشێر بێ هێزی دەوڵەتی (بارثەکان) و ئەو سیاسەتە نەرمەی کە لەسەر بنەمای پێدانی حوکمی فیدراڵی بۆ هەرێمەکان پەیڕەو دەکرا بە هەلزانی و دەسەڵاتی خۆی فراوان کرد و دەستی گرت بەسەر هەرێمی فارس، ئەمەش بووە هۆی تووڕەیی شای (بارثەکان) ئەردوانی پێنجەم و نامەیەکی بۆ ئەردەشێر نارد و تێدا هاتبوو: ((**تۆ سنووری خۆتت بەزاندووە و خۆت لە بیر کردووە، ئەی کورد لە نێو ڕەشماڵنشینە کوردەکان گەورەبووی و کێ مۆڵەتی پێداوی کە تاجی شایەتی لەسەر بکەیت و دەست بەسەر وڵاتدا بگریت و پاشاو خەڵکەکەیشیت خستۆتە ژێر دەسەڵاتی خۆت**))[١] لەم دەقەدا دەردەکەوێت کە ئەردەشێر کورد بووە یان لە نێو تیرە کوردەکاندا ژیاوە، چونکە کورد لەو سەردەمەدا لە هەرێمەکانی فارس و ئەهوازدا (خۆزستان) بڵاوبوبونەوە، هەروەها لەسەردەمی ئیسلامیش هەر لەو شوێنەدا هەبوون، هەروەها ئەوەش دەگەیەنێت کە کورد ڕۆڵی سیاسی لە ئێران دا هەبووە، تاوەکو توانیویەتی دەوڵەت دابمەزرێنێت.

شارستانییەت لە سەردەمی ساسانیەکان گەیشتە قۆناغی گەشەسەندن و پێگەیشتن، بە تایبەتی ئەوەی پەیوەندی بە سیستەمی دەسەڵات و بەڕێوەبردنی دەوڵەتەوە هەیە. حوکمڕانی ساسانیەکان ڕۆڵی فارسەکانی پتەوتر کرد لە ڕووی ڕامیاری و شارستانییەوە.

---

١ الطبری، تاریخ الامم الملوك، تحقیق محمد أبو الفضل ابراهیم،ط٤، (بیروت: ١٩٦٧)،ج٢،ص٣٩.



وێنەی ڕێ وڕەسمی بە پادشابوونی پاشای ساسانی ئەردەشێری بابەکان

## گرنگترین ڕووخسارە شارستانییەکانی سەردەمی ساسانییەکان:

### أ- سیستەمی حوکمڕانی:

سیستەمی فەرمانڕەوایی پاشایەتی پشتاوپشت بوو پاشا دەبوایە لە نەوەی ساسانی بێت، دەسەڵاتێکی ڕەهای هەبوو هەروەها ئەو دەسەڵاتە سیفەتەکانی مەزنایەتی و گەورەیی هەبوو، ئەمەش دەست و پێوەندەکانی پاشا و ڕێکخستن و تاقە گەورەکەی لە مەدائن.

شایەکانی ساسانییەکان هەوڵی دامەزراندنی دەوڵەتی ناوەندیان (مركزية) داو بەستنەوەی هەرێمەکان بە پایتەختەوە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ، بۆیە توانیان نیمچە دەوڵەتەکانی سەردەمی بارتەکان لەناوبەرن و پشتگیری عەرەبەکان ناوچە (حیرە) یان لە عێراق کرد، هەروەها پاشاکانی مەنازرە بوونە لایەنگریان لە پێناو پارێزگاریکردن لە سنووری ڕۆژئاوایان. شا ژمارەیەمی زۆر دەست و پێوەندی لە خۆی کۆکردبووەوە لەوانە سەرۆکی دیوانی پاشایەتی و پەردەدار (الحاجب) پاسەوانی پاشایەتی، کە مەراسیمی پێشوازی لە وەفدەکان و فەرمانبەرانی دەوڵەت ڕێك دەخەن پاشا لە جەژنی نەورۆزدا لەگەڵ خەڵکی ئاسایدا دادەنیشت و لەم میهرەجانەدا ڕێگە بە هەمووان دەدرا کە بێنە لای پاشا. سەرۆك وەزیران ڕۆڵێکی سەرەکی و

گرنگی دەبینی لە بەڕێوەبردنی دەوڵەت و سەرپەرشتی دیوانەکانی دەکرد، بۆیە بە فارسی بە (برزك فەرماداری) ناوزەند دەکرا، هەروەها چاودێری بەڕێوەبردنی هەرێمەکانی دەکرد و سەرپەرشتی دانوستانە دبلۆماسییەکانی دەکرد لەگەڵ وڵاتانی بیانی، لەبەر گرنگی ڕۆڵی وەزیر بە دەستەڕاستی پاشا دادەنرا.

## ب- چینەکانی کۆمەڵگا:

ئەردەشێری کوڕی بابك دادەمەزرێنەری دەوڵەتی ساسانی سیستەمی چینایەتی لە ئێران چەسپاند و لە لایەن پیاوانی ئایینی زەردشتیەوە دانی پیانرا، بۆیە دەرچوون لەم سیستەمە کارێکی ئاستەم بوو، کۆمەڵگەی ئێرانی لە سەردەمی ساسانییەکان لە چەند چینێك کە لە خوارەوە ناویان دێ پێکهاتبوو:

**١- پیاوانی ئایینی و لە سەرووی هەمووانەوە موبەزان (پاپای ئایینی زەردەشتی).**

**٢- ئەساوەر (الأساورە) (پیاوانی جەنگ) لە سەرووی هەموشیانەوە (سپاهبذ) (سەرکردەی باڵای سوپا) سەرکردەکانی سوپا بە (سەرۆك – زعیم) ناودەبران.**

**٣- نووسەران، گەورەی نووسەران بە (دبریدا) ناوزەند دەکرا.**

**٤- زۆرینەی گەل، کەلەوانە پێك دێت:**

- **ئازادەکان:** ئەمانەش جوتیارەکان و پیشەکار و خانەدان (النبلاو) و بازرگانی بچووکەکان دەگرێتەوە.
- **کۆیلەکان:** چینی یەکەم و دووەم ماف و دەستکەوتیان گەلێ زۆر بوو لەوانە باج نەدان، چینە گشتییەکان قورسایی باجەکان دەکەوتە سەرشانیان لەگەڵ ئەوەش ڕۆڵی ڕامیاریان پەراوێز کرابوو، بڕیارە ڕامیاریە گرنگەکان لە لایەن پاشا و ئەندامانی چینی ئۆرستکراتی لە پیاوانی ئایین و سەرکردەکانی سووپا و گەورە خانەوادەکانەوە دەردەکران.

## ج- ئایین:

ساسانیەکان هەوڵیان دا کەلەپووری ئەخمینەکان زیندووبکەنەوە بۆیە ئایینی زەردەشتیان کردە ئایینی ڕەسمی دەوڵەت شا (ئەردەشێر) و شاپوری کوڕی دەقەکانی ئاڤێستای کۆکردەوەو سەر لە نوێ نووسیەوە شیکردنەوەیان بۆ کرد ناویان لێنا (زند ئاڤێستا) لێکۆڵینەوی زند ئاڤێستا ناونرا (بازند)، وە بەهۆی سیستەمی چینایەتی لە ئێران و ڕۆڵی پیاوانی ئایینی و ئەندامانی چینی ئەرستۆکراتی، بزووتنەوەیەکی ئایینی- کۆمەلایەتی ڕوویدا بۆ دانانی سنوورێك بۆ دەسەلاتی ئەندامانی چینە ئۆرستۆکراتیەکان، لەوانە بزوتنەوەی (مانەوی) کە هانی لێبووردن و سۆفیگەری دەداو باسی لەبایەخ دان بە مافەکانی چینە گشتییەکانی دەکرد. مانەوەی بیروڕاکانی ئاینی مەسیحی و بوژی کاریگەری بوو. ئایینی مەسیحی دەستی کرد بە بلاوبوونەوە لە ئێران لە سەدەی چوارەمی زاینیەوە، و تووشی چەسپاندنەوە و سەرکوتکردن هاتن لە لایەن دەوڵەتەوە بەهۆی جەنگیان لەگەل ڕۆم دا چونکە مەسیحییەکانیان بە پشتگیری کردنی ڕۆمە بێزەنتیەکان تاوانبار دەکرد، چونکە ئایینی ڕەسمی بێزەنتیەکان مەسیحی بوو.

بەهۆی زیادبوونی دەسەلاتی پیاوانی ئایینی زەردەشتیەوە بزوتنەوەیەکی ئایینی – کۆمەلایەتی دیکە پەیدابوو بە نێوێ (مەزدەکی) کە بۆ (مەزدەك) دەگەڕایەوە و خۆی سەرکردایەتی دەکر. شاه (قوبادی یەکەم) پشتگیری لەو بزوتنەوەیە دەکرد بۆ بێ هێزکردنی دەسەلاتی سەرکردەکانی سوپاو چینی ئۆرستۆکراتی، (مەزدەك) داوای جێبەجێ کردنی (سۆسالیستی) (الاشتراكية) دەکردوو دابەشکردنی سامان بە شێوەیەکی دادوەرانە لە نێوان خەڵك، هەروەها داوای سۆفیگەری لە خۆ بردوویی دەکردو دوورکەوتنەوە لە چێژو هەوەس ئازار نەدانی زیندووەکان سروشت. لەگەل ئەوەی زەردەشتی توانی بەسەر هەردوو بزوتنەوەی (مانەوی و مەزدەکی) سەرکەوتوو بێت و بەرەنگاری مەسیحیەت بێتەوە، بەلام لەم کارەدا بەبێ هێزی و بێ توانای دەرچوو. هەروەها ململانێی نێو کۆمەڵگەی خراپی ڕەنگی دایەوە لەسەر دەوڵەت نێوەندی پاشایەتی بێ هێز بوو بەرەو داڕووخان چوو.

## مەدائـــن:

پایەتەختی دەوڵـەت بـە مەدائن ناوەزەندکـرا (سـەلمان پـاك) ی ئێـستا، چونکـە لـە چەندیـن شـاری تەنیشـت یەکـەوە هاتبـوو. هەروەهـا بریتـی بـوو لـە کۆمەڵگایەکـی نیشـتەجێی فـراوان کـە کۆشـکی پاشـاو دەسـت و پێوەندەکانـی و دیوانەکانـی دەوڵەتـی تێدابـوو. شـاکانی ساسـانیەکان چەنـد کۆشـکی نوێیـان دامەزرانـد لـەو ناوچەیـە. تاقـی کسـری (إیـوان کسـری) دیارتریـن ڕوخسـارەکانی بیناسازی لـە شـاری مەدائـن کـە تاقێکـی گەورەییـە بـە گـەچ و خشـت بنیـات نـراوە، بەشـێوەیەکی لاکێشـەیی هەیـە تاقێکـی گـەورە دەوری داوە و کەوانەیەکـی گـەورەی لەخشـت دروسـتکراوە تێدایـە، بەرزایـی تاقەکـە (٢٩م) دەبێـت پانـی (٢٦م) و درێـژی (٤٣م) لـە هـەردوو لای تاقەکـەدا دوو دیـواری بـەرز هەیـە کـە ڕووی پێشـەوەی کۆشـکی پاشـایەتی بـووە، کـە بـە چەندیـن کەوانـەی بیناسـازی ڕازاوەتـەوە، پاشـا لـەو کەوانـەدا (تاقانـەدا) بـە یـاوەری وەزیرەکانـی و کەسـانی دەسـتە راسـتی دادەنیشـت و پێشـوازی لـە نوێنـەری وڵاتانـی دیکـە دەکـرد، دیوارەکانـی تاقەکـە بـە قومـاش و مافـوری گرانبەهـا دادەپۆشـرا.

## ٥- چاکسازییەکانی کیسرا ئەنو شێروان (٥٣١- ٥٧٩م):

شـای ساسـانیەکان کیسـرای یەکـەم (خەسـرۆ) هەوڵـی چارەسـەرکردنی ئـەو گرفتانـەی دا کـە ڕووبـەڕووی خەڵـك دەبوونـەوە و، کـە لـە دەرئەنجامـی ناڕەزاییـە کۆمەڵایەتیەتـی و ئایینیـەوە سـەری هەڵدابـوو لەوانـە بزووتنـەوەی (مەزدەکـی). بەمـەش مافـی هەمـوو چیـن و توێژەکانـی گەلـی ئێـران بەپێـی سیسـتەمی چینایەتـی لەبـەر چـاو گرتبـوو، دوای لـە ناوبردنـی (مـەزدەك) و شـوێنکەوتوانی و گێڕانـەوەی مافـی خەڵـك لەوانـە بایەخـدان بـە ئافـرەت و داوای کـرد کـە چاودێـری بکـرێ و زاردا کـرا، و وەك ئاودێـری ڕووبارەکان و دروسـتکردنی پـرد و کەمکردنەوەیباجـی و هاندانـی زانسـت و فەلسـەفە، لێبووردەیـی ئایینـی نیشـاندا، لێژنەیەکـی دەسـتپاکی دانـا لـە پێنـاو دانانـی

سیستەمێکی باجی تازە کە ڕەچاوی چینە کۆمەڵایەتی و تواناکانیان کردبوو لە چینی هەژار و کەم دەرامەتەکان و ئەوانەی کە زەویەکانیان دووچاری کارەساتی سروشتی دەبووەوە خۆشدەبوو، ئەم کارانەی بووە هۆی سەقامگیری و خۆشگوزەرانی خەڵك و بۆیە بە پاشای دادپەروەر ناوزەن کرا. بەڵام کاریگەری چاکسازییەکان ماوەیەکی کەمی خایاند، بەهۆی بەردەوامی جەنگ لەگەڵ ڕۆمانیەکاندا، گرفتەکانی دەوڵەتی ساسانیەکان کەڵەکەی کردبوو، دوای مردنی (کیسرا) نەیتوانی ڕۆمەکان لە سوریا ولاتی ئەنادۆڵ دەربکات، دەرئەنجامی ئەم جەنگانە هەردوو ولاتی ساسانی و ولاتی ڕۆمەکانی لاواز و توانای بەرگری کردنیان زۆر کەم بووە، بۆیە خۆیان ڕانەگرت بەرامبەر عەرەبە موسوڵمانەکان کاتێك لە نیمچە دوورگەی عەرەبییەوە هاتن بۆ شام و عێراق لە پێناو بلاوکردنەوەی ئیسلام و سەروەری عەرەب.

## پرسیارەکانی بەشی شەشەم

پ١/ بایەخی مێژوویی دەوڵەتی ئەخمینی ڕوون بکەوە.

پ٢/ بەراورد بکە لە نێوان کارگێڕی دەوڵەت (بەڕێوەبردنی دەوڵەت) لە سەردەمی بارثیەکان (فەرثیەکان) و سەردەمی ساسانییەکان.

پ٣/ پەیوەندی نێوان عەرەب و فارسەکان لە سەردەمی ساسانیەکان ڕوون بکەنەوە.

پ٤/ ئەنجامەکانی شەڕی درێژ خایەنی نێوان فارس و ڕۆمەکان چی بوون؟

پ٥/ دەربارەی چاکسازییەکان شا کیسرا ئەنو شێروان بدوێ.

پ٦/ ئەم دەستەواژە لێك بدەوە: ((بزوتنەوەی ئایینیەکان بووە هۆی لێك ترازانی کۆمەڵگەی ئێرانی))

## سەرچاوەکانی بەشی شەشەم

١- أحمـد أميـن سـليم، فـي تاريـخ الشـرق الأدنـى القجيـم، دار النهضـة، (بيـروت:١٩٩٠).

٢- أرثـر كريتستسـن، أيـران فـى عهـد الساسـانين، ترجمـة يحـى الخشـاب، (القاهـرة: ١٩٥٧).

٣- حسن بيرنيا، تاريخ إيران، القديم من البداية حتى نهاية العهد الساسانى، ترجمة محمد نوالدين و عبدالمنعم السباعي، (القاهرة:١٩٧٩).

٤- سـامى سـعيد الأحـد ورضـا جـواد الهاشـمى، التاريـخ الشـروق الادنـي القديـم – أيـران و الاناضـول (بغـداد:١٩٨٥).

٥- سـامى سـعيد الآحمـد و جمـال رشـيد احمـد، تاريـخ الشـرق القديـم، (بغـداد: ١٩٨٨).

٦- طـه باقـر، مقدمـة فـى تاريـخ الحضـارات القديمـة/ط٢، (بغـداد: ١٩٥٦)، جـ٢.

# بەشی حەفتەم

## أ- شارستانییەتی ئیسلامی

## ب- شارستانییەتی میرنشینە کوردییەکان

# بەشی حەفتەم



## تەوەرەی یەکەم: شارستانییەتی ئیسلامی

### بەندی یەکەم: خەلافەی ئیسلامی

#### أ-چەمکی خەلافە

مەبەست لە چەمکی خەلافە لە مێژووی ئیسلامیدا، ئەو قەوارەی سیاسییەیە کە جێگرانی پێغەمبەر (د.خ) فەرمانڕەوایی دەکەن و بەڕێوەی دەبەن و دەستووری و شەرعیەتی ئیسلام پەیڕەو دەکەن.

لە ڕووی زمانەوانەیەوە خەلافە لە فرمانی (خلف – یخلف)ی زمانی عەرەبیەوە وەرگیراوە کەواتە جێنشینی و شوێن گرتنەوە دەدات بەدەستەوە و لە قورئانی پیرۆزدا چەند جار بەم مانایە دوویات بوەتەوە.

وەك زاراوەش واتە سەرۆکایەتیکردنی جەماوەری موسوڵمان لە کاروباری ئایینی و دنیایجا لە لایەن خەلیفەوە و درێژە پێدانی دەسەڵات و ڕێبازی پێغەمبەر (د.خ) و جێبەجێ کردنی بەرنامەی ئیسلام.

بیرمەندان و زانایانی موسوڵمانی وەك (ماوەردی و ئەبو ئەعلا) بەوردی و قووڵی لە بنەما و ناوەڕۆکی سیستەمی خەلافەیان کۆڵیوەتەوە و گرنگی و پێویستی هەبوونیان دیاری کردوە و ماف و ئەرکەکانی خەلیفەیان خستۆتە ڕوو، هەروەها جەختیان لەسەر ئەوە کردوە کە ئەو کەسەی بۆ پۆستی خەلافە دێتە هەڵبژاردن دەبێت مرۆڤێکی خواناس و ڕاستگۆ و دادپەروەر و هۆشیار و تەندروست بێت و تەواو لە ئایین و شەریعەت ئیسلام

شارەزا بێت، بەڵام کاتێك حیزب و گروپە ئایینیەکان و ڕەوت و قوتابخانە بیری و فەلسەفییەکان لە مێژووی ئیسلامدا سەریان هەڵدا ئەمانە خاوەنی بەرنامە و تێڕوانینی سیاسی و هزری خۆیان بوون، و بۆچوونی جیاواز و دوور لەیەکتر هەبوو لەمەڕ چەمکی خەلافە و دەستنیشانکردنی ناسنامە و ئەدگاری ئەو کەسانەی کە هەقیان هەیە بکرێن بە خەلیفەی موسوڵمان.

## ب-کورتەیەکی مێژووی خەلافەت:

خەلافەتی ئیسلامی بە چەند قۆناغێکی مێژووی جیاوازدا تێپەڕ بووە وەك بەم شێوەیە:

### ١-خەلافە لە سەردەمی راشیدیندا (١١-٤١کۆچی/٦٣٠-٦٦١ زاینی):

پێغەمبەر (د.خ) ڕاستەوخۆ کەسێکی دیار نەکردبوو جێگەی بگرێتەوە و دەیویست ئەم پرسە بۆ هەڤالان و یاوەرانی بهێڵێتەوە، کاتێك ساڵی ١١ی کۆچی/ ٦٣٢ کۆچی دوایی کرد.

#### ئەبوبەکر سدیق:

دوای کۆچی دوایی پێغەمبەر (د.خ) زۆربەی موسوڵمانان لەسەر ئەوە ڕێککەوتن کە ئەبوبکر سدیق ببێتە خەلیفە. چونکە هەڤاڵێکی دڵسۆز و جێی باوەڕی پێغەمبەر بوو لە ڕیزی پێشەوەی ئەو کەسانە بوو کە بڕوایان بە پێغەمبەرایەتی محەمەد (د.خ) هێناو لەلایەن پێغەمبەرەوە نازناوی (صدیق- ڕاستگۆی) پێ بەخشرائەوە بوو سەرەتاکە لە (سەقیفەی بەنی ساعیدە) هەڵبژێردراو بیعەت کرا، دواتر لە مزگەوت لەلایەن موسوڵمانەوە بڕوای پێدراو و ناونرا خەلیفە پێغەمبەر خودا. لەو ڕۆژە وە تا داگیرکردنی بەغدا و لە ناوبردنی خیلافەی عەباسی لەسەر دەستی هۆلاکۆ و لەشکری مەغۆل ساڵی ٦٥٦کۆچی/١٢٥٨ زایینی سیستەمی خەلافە بەردەوام بوو. خەلافەتی ئەبوبکر دووساڵ و چەند مانگێکی خایەند، لەو ماوە کورتەدا

خەلیفەی یەکەم بەردەوامی و پابەندی خۆی بەبنەماکانی ئیسلام سەلماند، یاخیبوون و پاشگەزبوونەوەی هەڵگەڕاوەکانی (أهل الردة) لە نیمچە دوورگەی عەرەب سەرکوت کرد و سەروەری ئیسلامی لە ناوچەکە چەسپاندەوە، لەلایەکی ترەوە درێژەی بە پرۆسەی فەتحکردن دا.

ئەبوبکر لە چارەنووسی دەوڵەتی ئیسلامی دەترسا و پێشبینی بەرپابوونی دووبەرەکی و ناکۆکی دەکرد لە نێوان خوازیارانی خەلیفایەتی، بۆ پێشگرتن لەم مەترسییەوە لە دوا رۆژەکانی تەمەنیدا دوای راوێژ و پرس و ڕاوەگرتن عومەری کوڕی خەتابی بۆ جێنشینی خۆت پاڵاوت، ئەمەش نیشانەی زیرەکی و وردبینی ئەبوبەکر بوو بەراستی عومەر شایستە بوو ئەرکە بگرێتە ئەستۆ.

## عومەری کوڕی خەتاب:

خەلیفە عومەر بە ئەزموون و لێهاتوو و چاوکراوە بوو، بناغەی دەوڵەتی ئیسلامی دارشت کاروبارە دارایی و کارگێرییەکانی رێکخستن و ناکۆکییە ناوخۆییەکانی ریشەکێش کرد و درێژەی بەجەنگی فەتح و فراوانخوازی دا و بەخۆی سەرپەرشتی بەرەکانی شەڕی دەکرد و ئاراستەی هێرشەکانی دەستنیشان دەکرد و هەرێمەکانی عێراق و خوزستان و کوردستان (شارەزوور و جەزیرە) و ئازەربایجان و شام فەتحکران و خزانە ژێر رکێفی خەلافەی ئیسلامیەوە، موسڵمانەکان وێڕای نازناوی خەلیفە بە رابەری باوەڕداران(أمیر المؤمنین) ناویان دەهێنا کە پتر ناوەرۆکێکی سیاسی و سەربازی هەڵدەگرێت. خەلیفە عومەر لە کۆتایی ساڵی ٢٣ کۆچی/٦٤٤ زایینی بە دەستی (أبو لؤلؤة) فیروز بە سەختی بریندار کرا پێش ئەوەی گیان لە دەست بدات دەبوو یەکێك لە گەورە پیاوانی دەوڵەت هەڵبژێری جێگەی بگرێتەوە، ونەیدەویست یەکێك هەڵبژێرێ ببێتە هۆی سەرهەڵدانی رکەبەری و ناتەبایی و ئەم ئەرکەی سپارد بە شەش پیاوماقوڵ لە هەڤاڵانی پێغەمبەر (د.خ) کە بریتی بوون لە عبدولرەحمانی کوڕی

عەوف، عەلی کوڕی ئەبوتالیب زوبێری کوڕی عەوام، عوسمانی کوڕی عەفان، تەلحەی کوڕی عوبێدولڵا، سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس و ئەمانە دەستەی ڕاوێژکاری (أهل الشوری) بوون و پێی ڕاگەیاند ڕێکبکەون و لەناوخۆیان یەکێك هەڵبژێرن و عبدولڵای کوڕیی لە مافی خۆپاڵاوتن بێ بەشکرد، نەبادا نەریتی پشتاوپشتی (الوارثة) لە پایەی خەلافە بچەسپێت، سەرئەنجام دەستەی راوێژکاری لەسەر هەڵبژاردنی عوسمانی کوڕی عەفان ڕێکەوتن،هەرچەندە عەلی کوڕی ئەبی تالیب خۆی بەشایەنتر دەزانی بەناچاری عوسمانی هەڵبژارد.

## عوسمانی کوڕی عەفان:

خەلیفە عوسمان هەرچەند درێژەی بە جەنگی فەتح داو وبڕیاری دا سوڕەت و ئایەتەکانی قورئان پیرۆز کۆبکرێنەوە، لە سەردەمی ئەواد فیتنە لە نێو موسوڵماندا دەرکەوت بەگوێرەی دەستەی راوێژکارەکانی هەڵسوکەوتی دەکرد لە نەریتی خێڵەکی پەیرەو کردو هەندێك کارو کردەوەیان ئەنجامدا بەدەربوون لە ڕێبازی پێغەمبەر (د.خ) و ڕێڕەوەی ئەبوبکر و عومەر و بوونە مایەی رەنجاندنی دڵی هەندێك موسوڵمانان و یاخی بوونی والیەکانی سەر هەرێمەکان و کار بەوە گەیشت لە ساڵی ٣٥ کۆچی/٦٥٥ میلادی هەندێك لە خەڵك و سوپا خەلیفەیان لە ماڵەکەی خۆی گەمارۆدا داوایان لێکرد دەست لەکاربکێشێتەوە ئەویش ئەم داواکاریەی رەتکردەوە هەڵیان کوتایە سەری شەهیدیانکرد، ئەمە لە حالەتێکدا کە خەلیفە قورئانی دەخوێندەوە و بۆ پاراستنی گیانی موسوڵمانان شەڕی لەگەڵ هێرشبەرەکان نەدەکرد. ئەو ئاژاوە و ئاشووبە (الفتنە) هۆکاری زۆری هەبوو دیارترینیان دەمارگیری خێلایەتی و بڵاوبوونەوەی خراپەکاری تەنگ و چەڵەمە لەلایەن کەسانی وەکو (عەبدولڵای کوڕی سەبە) و خۆشکردنی ئاگری ئاژاوەکە.

## عەلی کوڕی ئەبوتالێب:

نەیارانی عوسمان و زۆربەی کۆچیاران و پشتیوانان(المهاجرین والأنصار) عەلی کوڕی ئەبی تالیبان بە خەلیفە هەڵبژارد و بە رابەری باوەڕداران ناویان دەبرد و نوێنەری هەرێمەکانیش بەم هەڵبژاردنە رازی بوون تەنها والی شام معاویەی کوڕی ئەبو سفیان نەبێت کە لە بەرەبابی خەلیفە عوسمانی بوو و یەکسەر پالاوتنی عەلیی رەتکردەوەو دروشمی تۆڵەسەندنەوەی خوێنی عوسمانی بەرز کردەوە، هەروەها عائیشەی خێزانی پێغەمبەر(د.خ) بە خیلافەتی عەلی ناڕازیبوو ولەشکرێکی لە هاوبیرانی کۆکردەوە کە زۆربەیان لە هەڤالانی پێغەمبەر بوون عەلیش لەشەڕی ( الجمل) بەرەنگاریان بووەوە و ژمارەیەکی لێ کوشتن و عائیشەی بەڕێزەوە گەڕاندەوە بۆ مەکە.

لەو رۆژە پایەی بەرزی خەلافەکە کەلێنی گەورەی تێکەوت و بەها پیرۆزەکانی لەکەدار بوون و ئاژاوەو ناتەبایی و ململانێ کەوتە نێو جەماوەری موسڵمانەوەو سەدان لە هەڤالانی پێغەمبەرو سەرکردەی موسڵمانان بەم هۆیەوە تێداچوون.

دووبەرەکی خەلیفە عەلی و معاویە شەڕی( الصفین)ی لێکەوتەوەو معاویە بەزۆرزانی خۆی خەلیفە عەلی و یاوەرانی لەخشتەی بردو گرەوی لێ بردنەوەو دارو دەستەکەی بەیعەتیان دایێ و کردیان بەخەلیفەی خۆیان و لەبەرەی لایەنگرانی عەلیشدا کۆمەڵێك توندڕەو جیابوونەوەو عەلیان بەوە تاوانبار کرد کە چۆن لەگەڵ معاویەدا دانوستاندن دەکات و ڕێکدەکەوێت و ناوی شوراتەکان(الشراه) یان لەخۆنا کەچی بەلەڕێ دەرچوون (الخوارج) ناویان دەرکردو دایان نابوو عەلی و معاویەو عەمری کوڕی عاس بکوژن، کەچی تەنها عەلی بەرکەوت ولە مانگی رەمەزانی ساڵی ٤٠ کۆچی/٦٦١ زایینی لەمزگەوتی کوفە شەهیدیان کرد.

**٢- خەلافــەت (جێنشــینی) لەســەردەمی ئەمــەوی(٤١-١٣٢ کۆچــی/ ٦٦١-٧٤٩زاییینــی)؛**

پـاش شـەهیدکردنی خەلیفـە عەلـی، حەسـەنی کـوڕە گـەورەی نەرمـی نوانـدو دەسـتبەرداری مافـی خەلافـەت بـوو شـێوازی دانوسـتاندنی گرتە بـەر، معاویەش چـووە نـاو شـاری کوفەوەو(پشـتگیری) بەیعەتـی لـە خەڵکـی عێـراق وەرگـرت، دواتـر چـووە حیجـاز لەوێـش بەیعەتـی کـراو بـە فەرمـی بـووە خەلیفـە و شـاری دیمەشـقی لەوڵاتـی شـام کـردە پایتەختـی خەلافـەت و بـڕوای بـە خەڵکـی عێـراق و نیمچە دوورگـەی عـەرەب نەبـوو و گومانـی لـێ دەکـردن لـە ناویـان بمێنێتـەوە کەچـی ئـەو خێڵـە عەرەبانـەی کۆچیـان کردبـوو بـۆ شـام لایەنگـر و گوێڕایەڵـی بنەماڵـەی ئەمـەوی بـوون.

لەســەردەمی ئەمــەوی ، لــە هەڵبژاردنــی خەلیفــە راوێژکــردن و پــرس و ڕاگۆڕینــەوە پشــتگوێ خــران و پەیــڕەو نەدەکــران بەچەشــنی هــەردوو دەوڵەتــی ساســانی و بیزەنتــە بنەمــای پشتاوپشــتی (مبــدأ الوراثــه) پیــادا دەکــرا. دوای مردنــی خەلیفەیــەك، کوڕێکــی یــان برایەکــی جێگــەی دەگرتــەوە و بــێ گوێدانــە ڕاو بۆچوونــی میللــەت و بەرژەوەنــدی بــەرزی خەلافـەت. دوای مردنـی معاویـە ویەزیـدی کـوڕی جێگـەی گرتـەوەو ئـەم نەریتـە بـە یەکجـاری چەسـپاو عەباسـییەکان و فاتمییەکانـی میسـریش پەیڕەویـان کــرد.

**٣- خەلافەت لەسەردەمی عەباسییەکاندا (١٣٢-٦٥٦ کۆچی ٧٤٩-١٢٥٨ز)؛**

عەباسـییەکان دوای چارەکـە سـەدەیەك خەباتـی نهێنـی و ڕێکخراوەیـی لـە سـاڵی ١٣٢ کۆچـی / ٧٤٩ زایینـی و بـە پشـتیوانی مەوالییـەکان توانیـان دەوڵەتـی ئومـەری لـە ناوببـەن و دەسـەڵات بگرنـە دەسـت و بۆمـاوەی پتـر لـە پێنـج سـەدە خەلافەیـان بـە دەسـتەوە بـوو.

سیسـتەمی خەلافـەت لەسـەردەمی عەباسـی هیـچ چاکسـازی و پێشـکەوتنێکی باشـی بەخـۆوە نـەدی، سـەرەڕای پشتاوپشـتی ، نەریتـی تـر هاتـە کایـەوە کـە

هەرگیز لەگەڵ لێکدانەوەی فیقهی و بیری ئیسلامیدا نەدەگونجان و کەسانی وا دەبوونە خەلیفە کە هێشتا لە تەمەنی مێرد منداڵی و هەرزەکاریدا بوون. موقتەدیر(المقتدر بالله)(٢٩٥-٣٢٠کۆچی/ ٩٠٨-٩٣٢ زایینی) ئەو کاتەی پۆستی خەلیفەی گرتە دەست تەمەنی تەنها سێزدە ساڵان بوو و هەندێك خەلیفە زیاتر لە کوڕێکی خۆی دیاری دەکرد تا ببنە جێگری، هارونە رەشید(هارون الرشید)سێ لە کوڕەکانی دەستیان کرد تا یەك لە دوای یەك جێگەی بگرنەوە، لە لایەکەی ترەوە لە دەرەنجامی کێشەو ململانێیە ناوخۆییەکانی دەوڵەتی ئیسلامی لە سەردەمی ئەمەوی و سەرەتای سەردەمی عەباسی، ژمارەیەك دەستەو گروپی ئایینی وهزریی سیاسی ئامێز دەرکەوتن کە هەریەکەیان تێڕوانینی خۆی هەبوو لەمەڕ چەمکی خەلافەو موسڵمانان کە لەزۆر لایەنەوە جیاواز، بەڵکو ناکۆك بوو لەگەڵ تێڕوانینی دەستەو لایەنەکانی تر. خەلافەی عەباسی بەچەند قۆناغدا تێپەڕیوە:

## ١- قۆناغی بەهێزی (١٣٢-٢٢٧ کۆچی/ ٧٤٩- ٨٤٢ زایینی)

لەم قۆناغەدا سەرەڕای هەڕەشەی بزاڤە چەکدارییە بەرهەڵستەکانی ناوخۆو، خەلیفەکان بەهێزو خاوەن دەسەڵات بوون. کاروباری دەوڵەت لە دامەزراندن و لابردنی وەزیرەکان و والیەکان و بڕیاردان و هەڵویست وەرگرتن و تەنانەت سەرکردایەتی سوپاش بە دەستی خەلیفەکانەوە بوو.

## ٢- قۆناغی دەسەڵاتی سەرکردە تورکەکان(٢٢٧-٣٣٤کۆچی/٨٤٢- ٩٤٦زایینی):

لەم قۆناغەدا، خەلیفەی عەباسی هیچ دەسەڵات و سەروەریەکی نەما، تەنها بەناو وەك هێماییەکی مابۆوەو سەرکردە تورەکان بەخواست و ئارەزووی خۆیان دەجولانەوەو دەوڵەتیان بەڕێوە دەبردو هیچ ڕێزو شکۆمەندیان بۆ خەلیفە دانەنا، هەرکاتێك بیانویستایە خەلیفەیان لادەبردو سەرکۆنەیان دەکردو یەکێکی تریان لە شوێنی دادەمەزراندو هەرخەلیفەیەك سەرپێچی بکردایەو بەدڵی تورکەکان هەڵسوکەوتی نەکردایە ئەو چارەنووسی کوشتن یا بە زیندانی کردن و چاو هەڵکولان بوو، لەماوەی دەساڵدا

(٢٤٧-٢٥٦كۆچـی/ ٨٦١-٨٧٠ زایینـی) پێنـج خەلیفـە: متوەکیـل، مونتەسـر، موسـتەعین، موعتـەز، موهتـەدی، بەفیتـی تورەکـەکان کـوژران یـان لەسـەرکار لابـران.

لەمانـەش ترسـناکتر لـە کۆتایـی سـەدەی سـێهەمی کۆچـی/ سـەرەتای سـەدەی دەیەمـی زایینـی فاتمییـەکان لەرۆژئاوایـی ئیسـلامی دەرکەوتـن و دامەزراندنـی خیلافـەی فاتیمـی شـیعیان راگەیانـد ولـە سـاڵی ٣٥٨ کۆچـی/ ٩٦٩ زایینـی کۆنترۆلـی میسـریان کـرد و شـاری قاهیرەیـان دروسـتکرد و کردیانە پایتەخـت، هەروەهـا لـە سـاڵی ٣١٧ کۆچـی / ٩٢٩ زایینـی ئەمەوییەکانیـش لـە وڵاتـی ئەندەلـوس ئـەم هەنگاوەیـان نـاو میرنیشـینەکان بـە خەلافـە نـاوزەد کـرد، میـر عبدولڕەحمـان ناسـری ئەمـەوی نازنـاوی خەلیفـەی لـە خۆنـا.

فاتمییـەکان و ئەمەوییەکانـی ئەندەلـوس نەدانیـان بەشـرعیەتی دەسـەڵاتی یەکتـر دەنـا و نەبەشـەرعیەتی خەلافـەی عەباسـی لەبەغـدا، بەڵکـو فاتمییـەکان هـەر لەسـەرەتاوە بەهەمـوو ڕێگـەو شـێوازێك کاریـان دەکـرد خەلافـەی عەباسـی لەبنـەوە هەڵتەکێنـن و عێـراق و حیجازیـش بخەنـە ژێـر دەسـەڵاتیانەوە.

## ٣- سەردەمی بوەیهی (٣٣٤- ٤٤٧ کۆچی / ٩٤٦- ١٠٥٥ زایینی):

خەلیفـەی عەباسـی لـەم قۆناغـەدا لەوپـەڕی بـێ هێـزی و بـێ دەسـەڵاتی دابـوو، دەوڵـەت لەلایـەن بوەیهیەکانـەوە بەڕێـوە دەبـرا و خەلیفەیـان بـۆ سیاسـەت و لەبـەر ڕای گشـتی هێشـتبۆوە دوای ئـەوەی بـێ بەریـان کـرد لـە هەمـوو دەسـەڵاتە سیاسـییەکانی و موچەیەکـی مانگانەیـان بـۆ بڕیبـۆوە بـۆ خەرجـی و مەسـرەفی و نووسـەرێکیان بـۆ دادەمەزرانـد تـا ئیشـو کارو پێداویسـتییەکانی بـۆ هەڵسـوڕێنێ.

میـری بوەیهـی هـەردەم نـاوی لەگـەڵ نـاوی خەلیفـە دەهـات لـە خوتبـەی ڕۆژانـی هەینـی ولـە نەخشـاندنی دراودا، خەلیفـە تەنهـا ئەوەنـدەی بـۆ مابـۆوە بتوانێـت قازییـەکان و پێشـنوێژی مزگەوتـەکان و پیاوانـی ئایینـی دابمەزرێنێـت و سەرپەرشـتی کاروبـارە ئایینیـەکان بـکات و هەقـی ئـەوەی نەبـوو دەسـت لـە سیاسـەتی دەوڵـەت وەربـدات.

### ٤- سەردەمی سەلجوقی (٤٤٧-٥٩٠ کۆچی/ ١٠٥٥-١١٩٤ زایینی)

سەلجوقیەکان هەرچەندە دەستیان بەسەر بەغدای پایتەخت و هەرێمەکاندا گرت، بەڵام لە هەمان کاتدا خەلافەی عەباسیان ژیاندەوە و مەترسی فاتمییەکانیان دوورخستەوەو دوای مردنی سوڵتان مەلیکشا هی سەلجوقی لە ساڵی ٤٨٥ کۆچی/ ١٠٩٢ زایینی، دەوڵەتی سەلجوقی بەرە بەرە رووی لەکزی و لاوازی کرد، دووبەرەکی و شەڕو لێکدان کەوتە نێوان کوڕانی مەلیکشا میرانی دەوڵەتەوە ولە سەدەی شەشەمی کۆچی/ دوازدەهەمی زایینی قەڵەمڕەوی سەلجوقی پارچە پارچە بوو، خەلیفەی عەباسی بووە لایەنێکی ئەم هەڤڕکیە و پشتی سوڵتانێکی دەگرت دژی ئەوانی تر.

### ٥- سەردەمی بووژانەوەی خەلافە(٥٩٠- ٦٥٦ کۆچی/ ١١٩٤-١٢٥٨ زایینی)

دوای مردنی سوڵتان مەسعودی سەلجوقی ساڵی ٥٤٧ کۆچی/ ١١٥٢ زایینی سەلجوقیەکان دەسەڵاتێکی ئەو تۆبیان نەما، خەلیفە ناسر(الناصر لدین الله) (٥٧٥-٦٢٠ کۆچی/ ١١٧٩-١٢٢٣ زایینی) خەلافەی ژیاندەوە و دەسەڵاتی گرتەدەست دامودەزگاکانی خەلافەکەوتنەوە کار، هیچ دەسەڵاتێکی سیاسی لە سەرەوەی دەسەڵاتی سیاسی لە سەرەوەی دەسەڵاتی خەلیفە نەبوو، دەوڵەت و میرنیشینە ئیسلامیەکان ڕێزیان لێدەگرت و دانیان بەسەروەریی دەنا، هاوکات لەگەڵ لەناوچوونی خەلافەی عەباسی لە بەغدا مەملووکە تورکەکان لە میسرو شام دەسەڵاتیان گرتە دەست و بۆ ئەوەی شەرعیەت بدەن بە فەرمانڕەواییان هەڵسان ئەندامێکی بنەماڵەی عەباسیان بردە میسر و لە ساڵی ٦٥٩ کۆچی/ ١٢٦١ زایینی کردیانە خەلیفە بێ ئەوەی هیچ دەسەڵاتێکی پێ ببەخشن.



نەخشەی خانووەکانی خەلافەی عەباسی لە بەغدا لە سەدەی ٧ کۆچی / ١٣ زایینی

## بەندی دووەم: دیوانەکان:

دیوانەکان لە دەوڵەتی ئیسلامیدا بەهامان ئەرك، فەرمانی وەزارەتەکان سەردەمی نوێ و هاوچەرخ هەڵدەستان، واتە دیوانەکانی مێژووی سەدەکانی ناوەڕاستی ئیسلامی، وەزارەتەکانی ئێستان.

دوای ئەوەی دەوڵەتی تازە دامەزراوی ئیسلامی فراوان بوو و سنووری نیمچە دوورگەی عەرەبی بڕی و بەهەموو لایەکدا پەلی هاویشت چەندین هەرێم و باژێڕی لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا خستە ژێر ڕکێفی خۆیەوە، خەلیفەو کاربەدەستان نەدەشیان بەتەنیا کاروبارەکان هەڵبسوڕێنن و دەوڵەتی پێویست بە ڕێکخستن و دابشکردنی ئیش وکارەکان وهێنانەکەیەی دیوانەکان بوو تا کارەبان بەڕێکوپێکی بێ تەنگو چەڵەمە بەڕێوە بچن.

سەرەتا لە سەردەمی خیلافەتی عومەری کوڕی خەتاب کە بەیەکەم داڕێژەری بناغەی دامودەزگا کارگێڕییەکانی دەوڵەتی ئیسلامی دادەنرێت

دیوانی بەخشش(دیوان العطاء) دامەزرا بۆ دانانی ڕێوشوێنی دابەشکردن و بڵاوکردنەوەی ئەو پارە و سامانە بێشومارەی کە لە داهات و دەسکەوتی هەرێمە فەتحکراوەکانەوە دەستی موسڵمانەکان دەکەوت و نانووسکردنی ئەو موسڵمانانە شایەنی وەرگرتنی بەخشش و دیاریکردنی پشکی هەر یەکێك بەرەچاوکردنی خزمایەتی لەگەڵ پێغەمبەردا(د.خ) وپێشینەیی لە ئیسلامداو ڕادەی خزمەت و دڵسۆزی.

لەم دیوانەدا کە بەدیوانی سەربازەکان (دیوان الجند)یش دەناسرا ناو و ناسنامەو موچەو پلەو پایای و بژێوی شەڕکەر و جەنگاوەر و سەربازە موسڵمانەکان تۆمار دەکرا.

لە سەردەمی ئەمەویدا دیوانەکان زیادیان کرد و کارەکانیان فراوانتر بوو خەلیفەکانی ئەمەوی معاویەی کوڕی ئەبو سفیان و عبدولمەلیکی کوڕی مەروان و هیشامی کوڕی عبدولمەلیك برەویان بە دیوانەکاندا و ژمارەیەك دیوانی نوێیان کردەوە.

لە سەردەمی خیلافەی عەباسی پرۆسەی فەتحکردن رووی لە کزی کردەوە بەربەرە نەما و کۆمەڵگای ئیسلامی بووە کۆمەڵگایەکی مەدەنی و جێگیر، و ژیانی سەربازی و برەوی جارانی نەماو دامو دەزگا کارگێڕی و دارایی و دادپەروەرییەکانی دەوڵەت چەسپان و پێشکەوتنیان بە خۆوە دیت، دیوانەکان پتر کارابوون و ژمارەیەك دیوانی تر دامەزران کە سەرپەرشتی ڕاپەڕاندنی کارەکانی سەر شانیانی دەکرد کە وێڕای دیوانی دیوانی بەخشش، گرنگترینیان ئەمانەن:

## ١- دیوانی موڵکانە( دیوان الخراج):

ئەرکی بریتی بوو لە دیاریکردن و تۆمارکردنی ئەو زەوی و زارە کشتوکاڵیانەی باجی خەراج دەیانگرێتەوە و سەرپەرشتی وەرگرتن و کۆکردنەوە باجی مڵکانەو و سپاردنی. بە گەنجینەی دەوڵەتی دەکرد و دەبوو کەسانی کارزان و دڵسۆز و دەستپاك بەم کارانە هەڵسن.

## ٢- دیوانی پۆستە(دیوان البرید):

سەرپەرشتی ناردن و ئاڵو گۆڕکردنی نامەو هەواڵی لە نێوان هەرێمەکان و پایتەختدا دەکرد و یەکێکە لە دیوانە گرنگ و بەهادارەکان ولە ڕێگەیەوە خەلیفەو بەرپرسانی دەوڵەت ئاگایان لە گۆڕانکاری و پێشهاتەکانی هەرێم و ولایەتەکان دەبوو و بایەخی تایبەتی پێدەدراو کەسانی هۆشیار چوست و چالاك و ئەسپ و هێستری خێراو خۆشڕەوی بۆ دادەنرا.

و لەسەر ڕێگەی هاتن و چووندا خاڵی پارێزگاری و وێستگەی پشوودان هەبوون و نامەبەر کە بەخاوەن پۆستە ( صاحب البرید) دەناسرا وێستگانەدا پشووی دەدا پۆستەکەی دەدا بە یەکێکی تر بیگەهێنیتە وێستگەیەکی تر یان جێی مەبەست.

لە ڕۆژگاری جەنگی خاچپەرستەکاندا زەنگییەکان و ئەیوبیەکان لە هێنان و بردنی دەنگوباسی بەرەکانی شەڕ کۆتری نامەبەر- الحمام الزاجل- یان بەکاردەهێنا بەتایبەت لەو کاتەی هێڵەکانی گواستنەوە و گەیاندن دەبوونە ئامانجی هێرشەکانی دووژمن.

## ٣- دیوانی سکاڵا (المظالم):

ئەم دیوانە بە بڕیاری خەلیفە مەهدی کوڕی ئەبو جەعفەری مەنصور دامەزراو کارەکەی بریتی بوو لە ڕوانینی شکات و سکاڵای هاووڵاتیان دژ بە والییەکان و باجگران و کارمەندانی دەوڵەت و ئامادەکردنی سکاڵاکان و ڕێکخستنی ژووانی سکاڵاکاران لەگەڵ خەلیفەدا، خەلیفەکانی عەباسی خۆیان بەیناوبەین دادەنیشتن بۆ دیداری ستەملێکراوان و سەیرکردنی سکاڵاکاران، هەروەها ئەم دیوانە بۆی هەبوو لێکۆڵینەوە ئەنجام بدات و هەڵوێست وەربگریت دەربارەی دیاردەی بەرزبوونەوەی نرخی قوماش و کەلوپەلەکان لە بازاڕدا و هۆیەکانی زیندانیکردنی خەڵکی بێ لێپرسینەوە بەناهەق و دەست بەسەراگرتنی زەوی وزاری هاووڵاتیان.

## ٤- دیوانی نامە(پەیام):

هەندێك لە ڤەكۆڵەران (توێژەرەوان) وای بۆ دەچن كە نامەبەری یەكەم دیوانە لە مێژووی ئیسلامدا و سەرەتاكەی ئەو نامانەن كە پێغەمبەر(د.خ) دەیناردن بۆ پادشاكان و داوای لێدەكردن بڕوای بە ئایینی ئیسلام بهێنن. ئەركی دیوانی نامەبەری دارشتنی پەیام و نامە فەرمییەكانی خەلیفەیە بۆ والی و نوێنەرانی هەرێم ولایەتەكان و رێكخستنی نامەبەری دەوڵەت لەگەڵ وڵاتانی دەرەوەو ئامادەكردنی هەموو نووسراوێك كەلە لایەن خەلیفەوە دەردەچوو وەك بەیاننامەو و فرمان و رێككەوتننامە.

## ٥- دیوانی خەرجییەكان(النفقات):

كاری ئەم دیوانە چاودێریكردنی خەرجیەكانی سوپاو فەرمانگە كارگێڕییەكان و دابینكردنی دراو بوو دەكرێت بە فەرمانگەی پلاندانانی دارایی ناوببرێت.

## ٦- دیوانی مۆر(الخاتم):

كاری ئەم دیوانە مۆركردن و پشڕاستكردنەوەش بڕیار و فرمانەكانی خەلیفەیە وبە بڕیاری خەلیفە معاویە كوڕی ئەبوسفیان دانرا دوای ئەوەی نامەبەرێك دەستكاری نامەیەكی كردبوو و ناوەڕۆكەكەی كۆڕی بوو، ئەمیش بڕیاری دا فرمان و نامەكانی مۆر بكرێن و دانەیەكیان بەمۆمی سوور مۆر بكرێت لە شوێنێكی باوەڕ پێكراو هەڵبگرێت.

## ٧- دیوانی نەخشاندن(الطراز):

ئەم دیوانە هەڵدەستا بەدروستكردنی پۆشاك و جلوبەرگی فەرمی خەلیفەو گەورە كاربەدەستانی دەوڵەت و نەخشاندنی ئالاو بەیداخ و دروشمی تایبەت بە دەوڵەت.

## ٨- دیوانی سەدەقات(الصدقات):

کاری دیوانی سەدەقات بریتی بوو لە هەڵسوڕاندنی کاروباری سەدەقەو زەکات و دابەشکردنی بەسەر ئەو کەس ولایەنانەی کە پێیان دەشێت بەگوێرەی ئەوەی لە قورئانی پیرۆزدا باسکراوە. سەرەڕای ئەمانە، لەسەردەمی عەباسی چەند دیوانێکی تر دەرکەوتن لەوانە:

- دیوانی دەستبەسەر داگرتن(مصادرات) لەم دیوانە ناوی ئەو مڵکدارو خاوەن عەقاراتانە تۆمار دەکرا کە بەهۆی سەرپێچی و پابەند نەبوون بەیاساوە دەوڵەت دەستی بەسەر زەوی عەقاراتەکانیدا گرتبوو.

## ٩- دیوانی قەیران(الأزمة):

خەلیفە مەهدی لە پێناو بنەبڕکردنی گەندەڵی دیوانەکانی دەوڵەت ئەم دیوانەی دامەزراند کە لەچەند دیوانێکی بچووك پێك دەهات و هەر یەکەیان چاودێری هەڵسووکەوتی دیوانێکی دەکرد و چاوی بەکارەکانیان دەخشاندەوە دواتر هەر خەلیفە مەهدی دیوانی جەڵەوی قەیران (زمام الأزمة)ی دامەزراند بۆ چاودێری و بەدواداچوونی) چالاکییەکانی دیوانی قەیران (الأزمة).

ئەوەی جێگەی باسە زۆربەی بەرپرس و کارمەند و فەرمانبەر نووسەری دیوانەکانی هەردوو دەوڵەتی ئەمەوی وعەباسی لە میللەتە موسڵمانە ناعەرەبەکان واتە لە مەوالی بوون بەتایبەت فارسەکان لەبەر ئەوەی ئەزموونێکی باش و شارەزاییەکی تەواویان هەبوو لە کارگێڕی و بەڕێوەبردندا، هەروەها تا ساڵی ٨١کۆچی/ ٧٠٠زایینی زمانی نووسین دیوانەکانی هەرێمەکان هەر ئەو زمانانە بوون کە لەپێش ئیسلامدا بەکاردەهاتن، زمانی فارسی لە عێراق و هەرێمەکانی ڕۆژهەلات، زمانی یۆنانی لە ولاتی شام و زمانی قیبتی لە میسر، کاتێك عەرەبە موسڵمانەکان گەیشتنە ئەو هەرێمانە دەستکاری دیوانەکانیان نەکرد و وەك خۆیان هێشتیانەوە، چونکە سەریان لەو کارانە دەرنەدەچوو و شارەزاییەکی ئەوتۆیان لە بوارەکانی بەڕێوەبردندا نەبوو.

## پرسیارەکان

-پێناسەی چەمکی خەلافە (جێنشین).

- کارەکانی خەلیفە عەمەری کوڕی خەتاب بژمێرە پاشان روونی بکەوە بۆچی کەسێکی دەستنیشان نەکرد جێگەی بگرێتەوە.

- مەبەست چییە لە پشتاوپشتی؟ کەی لە پایەی خەلافەی ئیسلامی پەیڕەوکرا؟

- جیاوازیەکانی نێوان قۆناغی یەکەم وقۆناغی دووەمی خەلافەی عەباسی دیاری بکە.

- دیوانەکان بۆچی دانران و چۆن گەشیان کرد؟

- پێناسەی ئەو دیوانانە بکە: دیوانی سکاڵا، دیوانی نەخشاندن، دیوانی(زمام الازمە).

- جیاوازی نێوان دیوانی بۆستەو دیوانی نامەبەری روون بکەوە.

## سەرچاوەو ژێدەرەکان


- الماوردي، الاحكام السلطانية.
- ابن طباطبا، الفخري في الاداب السلطانية.
- الشهرستاني، الملل والنحل.
- الطبري، تاريخ الرسل والملوك.
- المسعودي، مروج الذهب ومعادن الجوهر.
- صبحي صالح، النظم الاسلامية.
- عبد العزيزالدوري العصر العباسي الاول.
- توفيق سلطان اليوزبكي، دراسات في النظم العربية الاسلامية.

## یەکـەم: هۆیەکانـی سـەرهەڵدان و گەشـەکردنی بزوتنـەوەی زانستی و هزری:

خوێندنـەوەو بڵاوبوونـەوەی قورئانـی پیـرۆزو لێکۆڵینـەوەی فەرموودەکانـی پێغەمبەر(د.خ)کـە دوو چاووگـی سـەرەکی شـەریعەتی ئیسـلامین، پاڵنـەرو هۆکارێکـی بزوێنـەر و کاریگـەر بـوون سـەرهەڵدان و گەشەسـەندنی بزوتنـەوەی زانسـتی و رووناکبیـری و هزریـی ئیسـلامی وهانـی موسـڵمانانیان دەدا بـۆ فێربـوون و خوێندنـەوە و داهێنـان. قورئانـی پیـرۆز سـەدان جار باسـی زانسـت و بیرکردنـەوەو هۆشـیاری و رامانـی کـردەوە( بخوێنـە- اقـرأ) یەکـەم پەیڤـە هاتۆتـە خـوارەوە لـە قورئـان، پێغەمبـەر(د.خ) زانسـتخوازی (طلـب العلـم) بـە ئەرکـی سـەر شـانی هەمـوو موسـڵمانان دانـاوەو لـەم بارەیـەو چەنـد فەرموودەیەکـی هەیـە.

میللەتانـی موسـڵمان هـەر لـە سـەرەتای موسـڵمان بوونیانـەوە دەسـتیان کـرد بـە فێربوونـی زمانـی عەرەبـی و خوێندنـەوەی قورئانـی پیـرۆز و لێکدانـەوەی مەبەسـت و واتاکانـی سـورەت و ئایاتەکانـی و کۆکردنـەوەی فەرموودەکانـی پێغەمبـەر(د.خ)و ناسـینەوەی فەرمـوودە راسـتەقینەکان و لێکۆڵینـەوەی ژیـان وکـرەوە و هەڵسـوکەوتی پێغەمبـەر و ناسـاندن و ریزبەندکردنـی ئـەو کەسـانەی دەمـاودەم کـرداروو گفتارەکانیـان گێڕاوەتـەوە تـا چـاوی لێبکـەن و پەیـڕەوی فەرموودەکانـی بکـەن، ئەمـەش وایکـرد چەنـد زانسـتێکی ئیسـلامی سـەر هەڵبـدەن وەك زانسـتەکانی: خوێندنـەوەی قورئـان، شـرۆڤەکردنی قورئـان و زانسـتە مرۆڤایەتییـەکان.

هۆیەکانـی هاتنـە خـوارەوەی ئایەتەکان(أسـباب النـزول)، زانستی(الناسـخ والمنسـوخ) زانسـتی ناسـینەوەی فەرمـوودە دروسـتەکان، زانسـتی هەڵسـانگاندن و هەموارکـردن .

لـه لایەکـی دیکـەوە بـەو پێیـەی پێغەمبـەر(د.خ) نێـردراوی خودایـە بـۆ هۆشـیارکردنەوەی مرۆڤایەتـی و ڕاگەیەنـەری پەیامـی قورئـان و پێشـەواو ڕێنیشـاندەری موسـڵمانانە، دەبوو موسـڵمانەکان بەژیـان و گـوزەران و خەباتـی بێوچانـی لـە پێنـاو سەرخستنی پەیامەکـەی ئاشـنابن و بزانن هەڤـاڵ ویاوەرەکانی کـێ بـوون و تیبگـەن لـە چ هـۆزو بنەماڵەیـەك بـوون و ڕۆڵ و بەشـداریان چـۆن وچەنـد بـوو لـە پشـتیوانی کردنـی پێغەمبـەر(د.خ) و بڵاوکردنـەوە ئایینـی ئیسـلام، هەروەهـا قورئانـی پیـرۆز لـە زۆر ئایەتـدا ئامـاژە بـۆ میللـەت دێرینەکان دەکات و بەسـەرهاتیان دەگێڕێتـەوە، لێـرەوە. مێژوونووسـی و نەژادناسـی وەك پێویسـتیەکی دەروونـی لای موسـڵمانان سـەریان هەڵـداو چەندیـن ناميلکـەو پەرتـوك دانـران سـەربارەت بەژیانـی پێغەمبـەر(د.خ) و جەنـگ و غەزاکانـی و ژیاننامـەی هەڤاڵەکانـی و نـەژادی و هـۆزو خێڵـە عەربـەکان و پرۆسـەی فەتحکردنـی هەرێمـەکان و مێـژووی ئـەو ڕووداو و گۆڕانکاریانـەی دووچـاری دەوڵەتـی ئیسـلامی هاتـن ئـەوە بـوو وەچەیـەك مێژوونـووس دەرکەوتـن وەك: (ابـن اسـحق)و(ابن هشـام)و(الکلبی) و(عبیـد بـن شـرية)و(المدائنی) و چەندانـی تـر.

لـە سـەدەکانی بەرایـی مێـژووی ئیسـلامدا تەنهـا بایـەخ دەدرا بـەو زانیاریانـەی پەیوەسـت بـوون بـە جەوهـەری ئیسـلام و ژیانـی پێغەمبـەری خـوداوە، لـە ئەنجامـی فەتحکردنـی هەرێمەکانـی شـام و میسـرو عێـراق و وڵاتـی فارسـەوە، عەرەبـە فاتیحـەکان بـە هەمـوو لایەکـدا بڵاوبوونـەوەو تێکـەڵ بـە میللـەت و نەتـەوەی جـۆر بەجـۆری خـاوەن شارسـتانییەت بـوون و کاریـان لـەو میللەتانـە کـردو پێیانیـش کاریگـەر بـوون، چونکـە لـەو هەرێـم وڵاتانـە شارسـتانییەتی دێریـن و پێشـکەوتوو هەبـوو دامـو دەزگای کارگێـڕی دارایـی و زانسـتی لـە ئارادابـوو.

هەروەهـا لـە سـەدەی دووەمـی کۆچـی/ هەشـتەمی زایینیـەوە بزاڤێکـی چالاکـی وەرگێـڕان لـە خیلافـەی عەباسـی سـەری هەڵـداو دەیـان سـەرچاوەی هـزری فەلسـەفی و گەردووناسـی و جوگرافـی و بیـرکاری و نـوژداری لـە لایـەن

وەرگێڕە سریانەکانەوە لە زمانی یۆنانیەوە وەرگێڕدرانە سەر زمانی عەرەبی. زانایانی موسڵمان بە دیدو سەرنج و بۆچوونەکانی رابەرانی شارستانییەتی یۆنانی ئاشنا بوون، هاوکات گروپ و رەوتە هزری و ئایینەکانی نێو کۆمەڵگای ئیسلامی وەك (المعتزلة)و( اخوان الصفا) و ئەوانی تر ڕۆڵی بەرچاویان گێڕا لە پێشخستنی رەوشی زانستی و ڕووناکبیری و سەرەنجام و بزاڤێکی هزری و زانیاری گشتگیر پەیدابوو. سەدان بیرمەند و فەیلەسوف و نوژدار و جوگرافیناسی و گەردووناسی و هۆشمەندی موسڵمان دەرکەوتن و لەبوارەکانی زانستە مرۆڤایەتیەکاندا داهێنیان کرد و شاکاری نایابیان بەرهەم هێنا، بەمەش خزمەتێکی گەورەی شارستانییەتی ئیسلام و هەموو مرۆڤایەتی یان کرد.

## دووەم: مەڵبەندەکانی بزوتنەوەی هزریی وشارستانی:

لە جیهانی پان و بەرینی ئیسلامیدا کە دەیان هەرێم وڵات و هەزاران شارو باژێڕ و شارۆچکەو گوند لەخۆ دەگرت، بایەخدان بەزانیاری و رۆشنبیری ئایینی و خۆ خەریککردن بەخوێندن و خوێندنەوەو و نووسین و دانان دیاردەیەکی ئاسایی بوو، توێژی ڕووناکبیران و خوێندەواران بە ئەرکێکی ئایینی پیرۆز و پێویستییەکانی گرنگی ژیانیان دادەنا، لە هەموو شارو باژێڕەکان مزگەوت و حوجرە و خوێندنگا هەبوون بزاڤی فێرکردن بەردەوام بوو و بەپلەیەك زانستەکانی قورئان و فەرموودە و زمانی عەرەبی دەخوێنران، هەرێم نەبوو ژمارەیەك شەرعزان و بیرمەند و مامۆستای تیا هەڵنەکەوتبێت یان نەبووبێتە نشینگەی زانایان و بیرمەندانی موسڵمان.
لەنێوان ئەم ژمارە زۆرەی شارو باژێڕەدا، هی وا هەبوون رەوشی سیاسی و ئابووری بۆ دەرەخساو لە قۆناغێکی مێژوویدا دەبووە تەوەرێکی سەرەکی بزوتنەوەی زانستی و هزری و لە داهێنانی شارستانیدا رۆڵی پێشکەنگی دەگێڕاو بە کۆمەڵ فێرخوازان و زانستپەروەران و ئەدەبدۆستانی لە ئامێز دەگرت.

## ١-مەككەو مەدینە:

لەسـەدە بەراییەکانـی مێـژووی ئیسـلامیدا هـەردوو شـاری مەککـەو مەدینـە بەهـۆی ئـەوەوە کـە یەکـەم لانکـەی ئیسـلام بـوون کرانـە ناوەندێکـی زانسـتی و هزریـی هـەرە گرنـگ، ئەندامـان و لایەنگرانـی ئـەم ناوەنـدە پتـر خەریکـی لێکۆڵینـەوە لـە زانسـتەکانی قورئـان و فەرمـوودەو عەقیـدە بـوون، هەروەهـا لـە مەدینـە قوتابخانەیەکـی مێژوونووسـی سـەری هەڵـداو بایەخـی دەدا بەنووسـینەوەی دەرکەوتنـی ئیسـلام و بڵاوبوونـەوەی بـە نیمچـە دوورگـەی عـەرەب و هەرێمەکانـی دەوروبەریـدا و تۆمارکردنـی ژیاننامـەی پێغەمبـەر (د.خ)و هەڤاڵانـی.

## ٢- عێراق:

لەسـەردەمی خیلافـەی عەباسـی، عێـراق چەقـی دەوڵەتـی ئیسـلامی بـوو شـاری بەغـدا لـە سـاڵی ١٤٥ کۆچـی/ ٧٦٢ زایینـی دروسـتکراو کرایـە پایتەخـت، لـە بەسـرەو کوفـە دوو قوتابخانـەی هـزری لێـك جیـا سـەریان هەڵـداو گرنگیـان بەزانسـتەکانی قورئـان خوێندنـەوەو فەرمـوودە گێڕانـەوەو هونەرەکانـی زمانـی عەرەبـی دەدا، لـە هەنـدێ بابەتـی ئایینـی و زمانەوانیـدا دیـدو تێڕوانینـی جیاوازیـان هەبـوو کـە گفتوگـۆ و لێـدەوان و بیـروڕا گۆڕینـەوەی دەهێنایـە کایـەوە، زانیایانـی عێـراق بەسـەر ئـەم دوو قوتابخانەیـە دابـەش بـوون.

لـە سـەدەی چوارەمـی کۆچـی/ دەیەمـی زایینـی، گروپـی (اخـوان الصفـا) لـە بەسـرا دەکەوتـن ولـە ژێـر کاریگـەری هـزرو فەلسـەفەی یۆنانیـدا، دەیانویسـت شۆڕشـێکی سـەرتاپاگیر بەرپـا بکـەن و کۆمەڵـگای ئیسـلامی بـەرەو باشـتر بگـۆڕن و لـە نامەکانیانـدا کـە لـە پەرتوکێکـدا بڵاوکرانـەوە گەلـێ پـرس و کێشـەیان خسـتۆنە ڕوو بەگوێـرەی تێگەیشـتنی خۆیـان چارەسـەریان بـۆ دانـاون.

هەرچـی بەغدایـە لـە ماوەیەکـی کەمـدا بـووە ناوەندێکـی ئاوەدانـی شارسـتانی و پڕبـوو لـە مزگـەوت وزانسـتخانە( دور العلـم) وکتێبخانـە و لـە ڕۆژ هـەڵات و ڕۆژئـاواوە، خوێنـدکارو فێرخـوازان ڕوویـان تێدەکـردو کـەم تـا زۆر تیایـدا

دەمانەوە، هەر زانایەکی موسڵمان پێویستایە پەرە بە ئاستی زانستی خۆی بدات دەبوو سەردانی بەغدا بکات لە دامەزراوە زانستیەکانیدا درێژە بەخوێندن بدات و خۆی پێ بگەیەنێت. گەلێ لە زانایانی ناوداری وەك (موسی الکاظم) و(أبو حنیفة) و(الجاحض) و(سیبویه) و (ابن قتیبه) و(الطبری)و( الغزالی) پەروەردەو پێگەیشتووی بەغداو ناوەندە زانستییەکانی تری عێراقن.

## ٣- شام و میسر :

وڵاتی شام لە سەردەمی زەنگییەکان و ئەیوبیەکاندا، بزوتنەوەیەکی زانستی و ئاواکاریی بەرچاوی بەخۆوە دیت لە شارەکانی دیمەشق و حەلەب و قودس وشارەکانی تر گەلێك مزگەوت و قوتابخانەو وخانەقا دروستکران، ئەگەر چاوێك بەهەردوو کتێبی (الاعلاق الخطیره) دانراوی (ابن شداد) و( الدارس فی تاریخ المدارس)ی دانراوەی(النعیمی) بگێڕین بۆمان ئاشکرا دەبێت کە میران و بەر پرسان و سامانداران و خێرخوازانی دەوڵەتی زەنگی و دەوڵەتی ئەیوبی تا چ ڕادەیەك خواناسی و ئاییندار و زانستپەرست بوونەو چەند پەرۆشی ئاواکردنی مزگەوت و قوتابخانەو و خەنەقا بوونەو چەندیان لە حسێبی خۆیان بنیات ناوە.

پاش گرتنی بەغداو لە ناوبردنی خەلافەی عەباسی ساڵی (٦٥٦ کۆچی/١٢٥٨ زایینی)و دەستبەسەراگرتنی هەرێمەکانی ڕۆژهەڵات لە لایەن لەشکری مەغۆلەوە سەنگ و قورسایی شارستانییەتی ئیسلامی بەیەکجاری گوێزرایەوە بۆ شام ومیسر، قاهیرە و دیمەشق و حەلەب شوێنی بەغدا و شارەکانی تری عێراقیان گرتەوە.

مەمالیکەکان کە دوای ئەیوبیەکان دەسەلاتیان لە شام و میسر گرتە دەست و بە چەشنی ئەیوبیەکان حەزیان لە کاری بیناسازی دەکرد و ئاوڕیان لە زانایان و ئەدیبان دەدایەوە و پشتگیریان دەکردن و ژمارەیەك دامو دەزگای زانستیان لە قاهیرە و دیمەشق و سەرجەم شارەکاندا ئاوا کرد، قاهیرە وەك بەغدای ڕۆژگاری عەباسییەکانی لێهات و بووە پایتەختی

زانیاری و بیرەمەندی و ویژە و بارەگای گردبوونەوەو پێ گەیشتنی زانایان و ئەدیبان، دیمەشق و حەلەبیش هاوشانی قاهیرە بوون دوو مەڵبەندی بە بڕشتی مێژوونووسی بوو.

لە ولاتی شام و میسردا بەهرەمەندانی وەك (ابن تیمیە) (ئیبن خەلکانی هەولێری) و(الذهبی) و(ابن کثیر) و(الزین العراقی) و(ابن حجر العسقلانی) و (السیوطی) دەیانی دیکە پێگەیشتن.

## ٤- ڕۆژئاوای ئیسلامی و ئەندەلوس:

ڕۆژئاوای ئیسلامی ئەو هەرێم و ولایەتانە دەگرێتەوە کە لە بیابانی ڕۆژئاوای میسرەوە دەست پێدەکات و تا کەنارەکانی ئۆقیانوسی ئەتڵەسی درێژ دەبێتەوە ئەم ناوچە بەرفراوان لە سەردەمی ئەمەوی فەتحکراو خرایە سەر دەوڵەتی ئیسلامی و شارەکانی قەیرەوان و فاس و مەراکش و تەلماسان و تەنجە بوون ناوەندی بلاوکردنەوە زانستی و ڕۆشنبیری ئیسلامی و مرابیتەکان (المرابطون) و موەحیدەکان (الموحدون) ڕۆڵی چاکیان گێڕا لە چاسپاندنی ئیسلام و پەرەپێدانی زانستە ئیسلامییەکان لە ناوچەکانی باکووری ڕۆژئاوای ئەفریقیا.

لە ولاتی ئەندەلوسیش کە هەشت سەدە لە ژێر فەرمانڕەوایی دەوڵەت و میرنیشینە موسڵمانەکاندا بوو، لەو ماوە درێژەدا بووبوە گۆرەپانی داهێنانی زانستی و رووناکبیری و ویژەیی ئیسلامی، قورتبەو غەرناتە و ئەشبیلیەو بەلنسیا(ڤالنسیا) لە ناوەندی زانستی و ویژەییەکان بوون، رەگەزی هونەری و ویژەیی وا لە ئەندەلوس دەرکەوتن کە لە ڕۆژهەلاتدا وێنەیان نەبوو.

لە ڕۆژئاوای ئیسلامی و ئەندەلوسدا گەلێ زانانی بلیمەت و نووسەری بە تواناو بیرمەندی زیرەك و لێهاتوو هەڵکەوتن و لەوانە (ابن عبد ربە) و(ابن رشد) و (لسان الدین ابن الخطیب) و ( ابن خلدون)، کە ناوبانگیان لە ڕۆژهەتیش دەنگی دابووە.

### ٥- خۆراسان و هەرێمەکانی ئەوپەری رۆژهەڵاتی ئیسلامی:

لەنێو ماڵباتە فەرمانڕەواکانی رۆژهەڵاتی ئیسلامیدا رۆڵ و جێپەنجەی سامانییەکان و غەزنەوییەکان دیارە لە پتەوکردنی دەسەڵاتی ئیسلام و بڵاوکردنەوەو و پێشخستنی زانستە ئایینیەکان، زانایانی رۆژهەڵات خزمەتێکی بێ پایەنی زانستی و فەرموودە و هونەرەکانی زمانی عەرەبیان کردووەو لە رەگەزە ئەدەبیەکاندا شاکاریان بەرهەم هێناوە، رێژەیەکی بڵندی زانایانی موسڵمان بە نەژاد خەڵکی شارو بازێڕو لادێکانی خۆراسان و هەرێمەکانی تری رۆژهەڵاتن، لە سەرچاوەکاندا دەیان زانای ناوداری بوخاری و بەلەخی سەمەرقەندی و مەروروزی و نیسابوری بەرچاو دەکەوتن.

**سێهەم: مزگەوتەکان و قوتابخانەکان**

مزگەوتەکان وێڕای ئەوەی جێگەی نوێژکردن و خواپەرستی بوون، هاوکات مەڵبەندی فێرکردن و خوێندن و پێگەیاندنیش بوون، تا نیوەی دووەمی سەدەی پێنجەمی کۆچی/ یازدەهەمی زایینی مزگەوت رۆڵی قوتابخانەو فێرگەشی دەگێڕاو چەند ژوورێکی لێ تەرخان دەکرا بۆ وانەگوتنەوەو فێرکردن.

مزگەوتەکان کە لە بنەڕەتدا جێگەی نوێژکردن و خواپەرستین، لە توانایان نەما ئاپۆرەی قوتابیان و فێرخوازان لە خۆ بگرن دوای ئەوەی ژمارەیان ساڵ بە ساڵ هەڵدەکشاو بازنەی بابەتەکانی خوێندنیش فراوان دەبوون، هەروەها وانە گوتنەوەی مامۆستایان و گفتوگۆ و دەنگە دەنگی قوتابیان کێشەیان بۆ قورئانخوێن و نوێژکەران دروست دەکرد وسەری لێ تێکدەدان بۆیە بیر لە جیاکردنەوەی شوێنی خوێندن کرایەوە لە مزگەوتەکان جێگەی تایبەتی بۆ تەرخان کراو ناونرا قوتابخانە و واباوبوو کە هەر لەتەنیشت مزگەوتەکان دروست بکرێن، سەرەڕای ئەم هەنگاوەش مزگەوتەکان رۆڵی زانستی خۆیان لە دەست نەداو ناو بەناو وبەڕادەیەکی کەمتر لە پێشوو وانەیان تێدا دەگوترایەوە.

## (نیزام مەلیك):

وەزیـری نـاوداری هـەردوو سـوڵتانی سـەلجوقی ئەلـب ئەرسـەلان (٤٥٥-٤٦٥ کۆچـی/ ١٠٦٣- ١٠٧٣ زاییـنی)و مەلیکشـا (٤٦٥-٤٨٥ کۆچـی/ ١٠٧٣-١٠٩٢ زایینی)بـوو خاوەنـی بیرۆکـەی دامەزراندنـی قوتابخانەیـە لـە مێـژووی ئیسـلامدا، کـە لـە سـاڵی(٤٥٧ کۆچـی/١٠٦٥ زاییـنی) لـە بەغـدای پایتەخـت دروسـتی کـرد بـە قوتابخانەی(النضامیـە) نـاوی دەرکـردو بـەرە بـەرە شـارو شـارۆچکە نەمـا قوتابخانەیـەك یـان زیاتـری لـێ نەبێـت، بـۆ نموونـە لـە شـاری هەولێـر قوتابخانەی(الربـض) و قوتابخانـەی قـەلاّ و قوتابخانـەی موجاهیدیـە هەبـوون و سـالاّنە پێشـوازیان لـە کۆمەڵێـك فێرخـوازی شـارەکەو دەوروبـەری دەکـرد.

لـە قوتابخانەکانـدا، سـەرەڕای زانسـتەکانی قورئـان و فەرمـوودەو ئوسـوڵ و عەقیـدە وزمانـی عەرەبـی کـە بەزانسـتی سـەرەکی و بنەڕەتـی دەژمێـردان، جورەهـا بابەتـی و ویژەیـی و هـزری دەخوێنـران، خوێنـدن چەنـد سـاڵێکی، دەخایەنـدو بـە سـەر چەنـد قۆناغێکـدا دابـەش دەکـرا، قوتابیـان لەسـەر دەسـتی مـەلاو مامۆسـتایان فێـری خوێنـدەواری دەبـوون، پێویسـت بوو لەسـەریان قۆناغ بـە قۆنـاغ ببـڕن ئەمجـا مۆڵـەت و بڕوانامـەی کارکردنیـان پـێ دەبەخشـرا.

لـە قوتابخانـە پێشـکەوتووەکاندا تایبەتمەنـدی هاتـە کایـەوە و هـەر زانسـتێك مامۆسـتایەکی پسـپۆڕو شـارەزا دەیگوتـەوە.

جگـە لـە وانەگوتنـەوە، کـۆڕو کۆبوونـەوەی زانسـتی و فەلسـەفیش لـە قوتابخانـەکان دەبەسـتران زانایـان و مامۆسـتایان ئەڵقەڕێـز دادەنیشـتن و گەنگەشـەی پـرس و بابەتـی جۆربـە جۆریـان دەکـرد.

لـە ڕووی داراییـەوە دەوڵەتـی دەسـەلاّتدار سەرپەرشـتی قوتابخانەکانـی دەکـرد و مووچـەی مامۆسـتایان و خەرجـی و پێداویسـتەکانی دەدا،

قوتابخانـەی واش هەبـوو خێرەخـوازان دروسـتیان دەکـرد و بـاخ و بێسـتان و گوندیـان لەسـەر وەقـف دەکـرد، لـە داهاتـی وقفکـراوەکان بژێـوی مامۆسـتایان و پێداویسـتیەکان دابیـن دەکـران.

## پرسیارەکان

-هـۆکار و پاڵنەرەکانـی دەرکەوتـن وگەشەسـەندنی بزوتنـەوەی زانسـتی و هـزری و ئیسـلامی بەخـاڵ بژمێـرە؟
- مەڵبەندە دیارەکانی بزوتنەوەی زانستی و هزری کامانەن؟
- بۆچی قوتابخانەکان لە مزگەوتەکان جیاکرانەوە؟
- (نیزام مەلیك) کێیە؟ پێناسە بکە.
- لە قوتابخانەکان، چ بابەتێك دەخوێنران؟

## سەرچاوەکان


- أدم ميتز الحضارة الاسلامية في القرن الرابع الهجري.
- حسن ابراهيم حسن، تاريخ الاسلام.
- شاكر مصطفي، التاريخ العربي والمؤرخون.
- أبو زيد شلبي، تاريخ الحضارة الاسلامية.
- أحمد أمين، فجر الاسلام.
- جرجي زيدان، تاريخ التمدن الاسلامي.
- خليل ابراهيم السامرائي. دراسات في الفكر العربي.

# تەوەرەی دووەم:



# بەشداری شارستانیانەی کورد لەسەدەکانی ناوەڕاست

## بەندی یەکەم:

### چەمکی سەدەکانی ناوەڕاست و کورتەیەك لەسەر کورد:

مەبەست لە چەمکی سەدەکانی ناوەڕاست ئەو قۆناغە مێژووییە کە دەکەوێتە نێوان سەدە کۆنەکان و سەردەمی نوێ و هاوچەرخدا ئەم قۆناغە تایبەتمەندی خۆی هەیەو لەگەڵێك بارو لایەنی چڤاکی و ئابووری و هزری وژیاریەوە جیاوازە لە سەردەم وقۆناغەکانی تر.

بۆ دیارکردنی سەرەتاو کۆتایی سەدەکانی ناوەڕاست، ڤەکۆڵەران و شارەزایانی مێژوو راو بۆچوون و تێکەیشتنی جۆربەجۆرو لێکجیایان هەیە، لە ڕاستیدا هەر میللەتێك یان هەر وڵات و دەڤەرێك هەلو مەرج و پێوەری مێژوویی تایبەتی خۆی هەیە کە ڕووداو و گۆڕانکارییە مێژووییەکان سەپاندویانە و خاڵی وەچەرخاندنیان لە ڕەوڕەوەی مێژوودا هێناوەتەکایەوەو لەبەر رۆشناییان قۆناغە مێژووییەکان دەستنیشان دەکرێت.

**مێژووی کوردو کوردستانیش لەم دەستوورە بەدەرنییە و دەکرێت بەم چەشنە دابەش بکرێت:**

**١- مێژووی کۆن - مێژووی چەرخە کۆنەکان:**

لە بەرە بەیانی مێژووی کوردستانی و کوردەوە دەست پێدەکات و بەردەوام دەبێت تا ڕۆژگاری پرۆسەی فەتحکردنی هەرێم و باژێڕەکانی کوردستان لەلایەن. عەرەبە و موسڵمانەکانەوە کە لە سەردەمی دووەم خەلیفەی راشیدی عومەری کوڕی خەتاب (١٣ -٢٣ کۆچی/ ٦٣٤- ٦٤٤ زایینی) ئەنجام درا.

## ٢- مێژووی سەدەکانی ناوەڕاست- چەرخێن ناڤینێ- سەدە ناوەنجییەکان:

لـە پرۆسـەی فەتحـی کوردسـتانەوە و تاجەنگـی چاڵدێـران سـاڵی (٩٢٠ کۆچی/ ١٥١٤زایینـی) و دووکەرتکردنـی کوردسـتان. گومانـی تێـدا نییـە کـە فەتحی ئیسـلامی هەرێـم و باژێڕە کوردنیشـینەکان و جەنگـی چاڵدێـران دوو ڕووداوی ئێجـگار گرنـگ و کارتێکـەرن لـە مێـژووی کـوردو کوردسـتان و بەخاڵـی گواسـتنەوە و گۆڕانکارییـەکان دەژمێردرێـن و کاریگـەری قـوڵ و چارەنووسسـازیان بەجێهێشـتووە و ژیـان و گوزەرانـی نەتـەوەی کوردیـان لـە قۆناغێکـەوە بـۆ قوناغێکـی تـری نـوێ و جیـاواز گواسـتنەوە، لەبـەر هەنـدێ ئـەم دوو ڕووداوە لـە دووی یـەك کـراون بەخاڵـی سـەرەتا و خاڵـی کۆتایـی سـەدەکانی ناوەڕاسـت. ئـەم قۆناغـەش دەشـێت بکرێـت بـەدوو سـەردەمەوە:

**أ- سەردەمی خەلافەتی ئیسلامی (١٨-٦٥٦ کۆچی/ ٦٣٩-١٢٥٨ زایینی):**

لـە گەیشـتنی موسـڵمانەکانەوە بـۆ باژێـڕی حەلـوان تـا گرتنـی بەغـدا لـە لایـەن لەشـکری مەغۆلـەوە سـاڵی (٦٥٦ کۆچـی/ ١٢٥٨ زایینـی) سـاڵی لەناوچوونـی خەلافەتـی عەباسـی دەگرێتـەوە.

**ب- سـەردەمی فەرمانڕەوایـی داگیرکەرانەی مەغـۆل- جەلائیری- تەیموری تورکمانـی قـەرە قۆنیلـۆ و ئـاق قۆنیلۆ:**

لەداگیرکردنـی بەغـداوە تـا جەنگـی چاڵدێـران ٩٢٠ کۆچـی/ ١٥١٤ زایینـی دەگرێتـەوە.

## ٣- مێژووی نوێ:

لـە جەنگـی چاڵدێـران تـا دەسـت پێکردنـی جەنگـی جیهانـی یەکـەم ١٩١٤-١٩١٨ز دەگرێتـەوە.

## ٤- مێژووی هاوچەرخ:

لەدەسـت پێکردنـی جەنگـی جیهانـی یەکەمـەوە ١٩١٤- ١٩١٨ ز تـا کاتـی ئێسـتامان دەگرێتـەوە.

## كورد لە سەدەکانی ناوەڕاستدا:

کورد نەتەوەیەکی دێرین و ڕەسەن و خانەدانە و یەکێکە لە نەتەوە مەزن و ناودارەکانی ڕۆژهەڵات، هەر لە مێژەوە لە زێد ونیشتمانی خۆی کە کوردستانە نیشتەجێ بووە و لەگەڵ سروشت و کەشوهەواکەیدا ڕاهاتووەو لەگەڵ شاخ و دۆڵ و نشێوو پێدەشت و ئاوی سازگاری کانی و ڕووبارەکاندا دەقی گرتوە و خۆی گونجاندەوە، بەردەوام بەربەرەکانی هەڕەشە و ترس و گوشارە دەرەکیەکانی کردوە و بەسەریاندا زاڵبوە.

لەسەدەکانی ناوەڕاستدا، کورد بە گەواهی گەڕۆك و مێژوونووناسی میللەتێکی دیارو ناسراو بوو بە پێی سەنگ و قەبارەی خۆی هەر گاڤ ڕۆڵی شایستە و شایەنی خۆی گێڕاوە و پشکداری بەرچاوی هەبوە لە هەموو ڕوداو و بۆنە و بەسەرهاتە پەیوەندارەکاندا و ئامادەبوونی کارای خۆی سەلماندوە، لە ڕووی سیاسی و سەربازیەوە دژی دەسەڵاتدارانی بیانی و داگیرکەرانی ڕاپەڕیوە، بژاڤ و سەرهەڵدان و شۆڕشی چەکداری بەرپاکردووە و بەرسینگی پەلامار و لەشکرکێش دوژمنانی گرتوە و سەرداریتی خێڵەکی و فەرمانڕەوایی و ناوەخۆیی و میرنشینی سەربەخۆ نیمچە سەربەخۆی لە ناوچە جۆربەجۆرەکانی وڵاتەکەیدا دامەزراندوەو پەیوەندی دۆستانەی لەگەڵ خەلافەتی عەباسی(١٣٢- ٦٥٦ کۆچی/ ٩٤٦-١٢٥٨ زایینی) و هێز و دەوڵەتانەی تردا گرێداوە.

لەسەردەمی خەلافەتی عەباسیدا، میر و سەردار و سەرەك هۆزەکانی کورد بە کەڵك وەرگرتن لە هەلەمەرجی سیاسی و ئابووری خەلافەت و بە سوود بینین لە توندی وقایمی دەڤەرە چیایی و دوور دەستەکانی کوردستان، چەندین فەرمانڕەوایی و میرنیشینی گەورە و بچووکیان دامەزراند و سەدان ساڵ کاروباری ناوەخۆیی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتیان بەڕێوە دەبرد، گەورەترین و بەناوبانگترین ئەم میرنیشنانە بریتین لە:

## ١- میرنشینی شەدادی:

لـە هەرێمـی ئـەڕان و ئەرمینـا لـە باكـووری كوردسـتان (٣٤٠-٥٩٥ كۆچـی/ ٩٥١-١١٩٩ زایینـی)، كـە باژێرەكانـی گەنجـە، دویـن (دبیـل) وئانـی و بەردەعـە یـان بەدەسـتەوە بـوو.

## ٢- میرنـشینی ڕەوادی(٣٣٧ -٤٦٧ كۆچی / ٧٤٨- ١٠٧٤ زایینی):

لـە هەرێمـی ئازەربایجـان (ئاترۆپاتـەگان) لـە شـارەكانی تەورێـز، مەراغـە، شـنۆ، ئورمێیـە، سـەلماس دامـەزراوە.

ئـەم دوو میرنشـینە لـە سەردەسـتی میرانـی دوو بنەماڵە هۆزی هەزبانـی كوردەوە دامەزرێنـراون، هەزەبانـی، هۆزێكـی هـەرە مـەزن و بـڵاوی كـوردە، چەندین لق و عەشـیرەتی و تیـرەی هەیـە كـە لـە دەشـتایی هەولێـر لـە ناوچـەی هـەردوو زێـی (زێـی گـەورەو زێـی بچـووك) وكێلەشـین و سـەلماس و لـە چواردەوری دەریاچـەی ئورمێیـە نیشـتەجێ بـوون.

## ٣- میرنشینی حەسنەوی بەرزیكانی (٣٤٨-٤٠٦ كۆچی/ ٩٥٩-١٠١٥ زایینی):

ئـەم میرنشـینـە لـە لایـەن ماڵباتێكـی دەسـەڵاتداری هـۆزی بەرزەیەكانـی كـوردەوە دامەزرانـدوە لەوڵاتـی شـارەزوور هەرێمـی چیـا و لـە سـەردەمی میـر حەسـنەویەی كـوڕی حوسـێنی بەرزیكانیـەوە كـە پتـر لـە بیسـت سـاڵ میرایەتـی كـردوە(٣٤٨-٣٦٩ كۆچـی/ ٩٥٩-٩٧٩ زایینـی)، بـوە بـە میرنشـینێكی بـە دەسـەڵات و وەك هێزێكـی ناوچەیـی كاریگـەر لـە لایـەن خەلیفـە عەباسـی و دەسـەڵاتدارانی بوەیهیـەوە دانـی پێدانـرا، هـەر بۆیـە بـە میرنشـینی حەسـنەوی دەناسـرێت.

پـاش مردنـی میـر حەسـنەویە ئـاژاوە و ناكۆكـی كەوتـە نێـو میرنشـینەكە و ماوەیـەك درێـژەی كێشا و بـەوە كۆتایـی هـات كـە میـر بـەدر بـووە جێنیشـینی باوكـی و بـۆ ماوەیەكـی درێـژ (٣٦٩ – ٤٠٥ كۆچـی/ ٩٨٠-١٠١٤ زایینـی) میرایەتـی كـرد، دوای مردنـی بـە ماوەیەكـی كـەم میرنشـینەكە لـە ناوچـوو.

بەربڵاوی کورد بووە چەند خێڵ و تیرە و لقێکی هەبووە، لە دەشتی هەولێر و ناوچەکانی هەردوو زێی گەورە و زێی بچووك و لە چیاکانی کێلەشین و سەلماس و لە دەوربەری گۆمی ورمێ نیشتەجێ بوو بوون.

## ٤- دەوڵەتی دۆستەکی- مەڕوانی (٣٧٢کۆچی- ٤٧٨ کۆچی/٩٨٢-١٠٨٥ زایینی):

لە هەرێمی جەزیرە و زۆزان ولە باژێرەکانی میافارقین، حوسنکێفیا، ئامەد(دیاربەکر)، ئەرزن، سەعرت، جزیرەی بۆتان دەکەوتووە.
ئەم میرنشینە لەسەر دەستی میر بادی کوڕی دۆستەکی بناغەی دانراوە، دوای کوژرانی ساڵی (٣٨٠کۆچی/ ٩٩٠ زایینی) خوارزا (خوشکەزا) کانی کە کوڕی میر مەڕوانی کوڕی کاکی کورد بوون درێژەیان بە دەسەڵاتدا، تیایاندا ئەحمەدی کوڕی مەڕوان کە پتر لە نیو سەدە میرایەتی کردوە (٤٠١-٤٥٣کۆچی/ ١٠١١-١٠٦١ زایینی) بەرچاوترین و چالاکترین دەسەڵاتداری کوردە میرنشینەکەی لە قەوارەیەکەی بچووکی ناوخۆییەوە بردە ئاستی دەوڵەتەکانی ناوچەکە، لەسەردەستی ئەودا دەسەڵاتی سیاسی میرایەتی کورد گەیشتە ترۆپك.

## ٥- میرنشینی عەنازی:

لە حلوان و شارەزوور (٣٨١-٥١١ کۆچی/ ٩٩١-١١١٧زایینی)، دوای لاوازبوون ولە ناوچوونی میرنشینی حەسنەوی بەرزیکانی بنەماڵەیەکی تری کوردی ناوچەکە کە عەنازیەکان بوون دواتر ناوچەی تریان خستەسەر لە هۆزی شازنجانی فەرمانڕەوایی شارەزووریان لە ئەستۆ گرت سەرەڕای ئەم میرنشینە دانپێنراوانە، چەند میرنیشینێکی بچووك سنورداردا ژمارەیەك قەڵاو شورا و باژێرو شارۆچکەیان بەڕێوە دەبرد وەك هۆزی هەزبانی لە هەولێرو دەوروبەری، هۆزی زەرزاری لە قەڵاو شارۆچکەکانی خەفتیان ( هاودیان)و رەواندوز و باڵەکان و سیدەکان، هۆزی حەمیدی لەهەردوو قەڵای ئاکرێ وشوش، هۆزی هەکاری لە قەڵاکانی ئامێدی ئاشب وهرور و جۆڵە مێرگ، هۆزی بۆتانی لە جزیرەی بۆتان و هەرێمی زۆزان، هۆزی(بەشنەوی)

بەژنەوی لە قەڵای فەنکی هەڵکەتوو لە باکووری جزیرەی بۆتان، هۆزی مەهرانی لە قەڵاو گوندەکانی ناوچەی زاخو، هۆزی رۆژەکی لە باژێڕی بەدلیس و دەوروبەری، هۆزی قەیموری لە قەڵای قەیمور لە هەرێمی دیار بەکر، هۆزی چۆپی لە هەردوو قەڵای شاتان و (حصن طالب).

ئەم میرنشینانە کاروباری سیاسی و سەربازی و ناوچەکانی کوردستانیان بەڕێوەدەبرد میرنشینە گەورەو ناسراوەکان خودانی دامەزراوە دامو دەزگاکانی کارگێڕی و دارایی و قەزائی و ئابووری خۆیان بوون، خەلیفەی عەباسی لە بەغدا دانی بەهەموویان دادەنا، میرەکانی کوردیش لای خۆیانەوە ڕێزی خەلیفەی عەباسییان دەگرت وبە هێمای دەسەڵاتی شەرعیان دادەنا و هەرگیز سەرپێچی فەرمان و بڕیاەکانیان نەدەکرد.

میرەکانی کورد دراویان بە ناوی خۆیانەوە لێدەدا پاش نەخشاندنی ناوی خەلیفەی عەباسی دەسەڵاتداری بوەیهی لە سەر دراوەکە، هەروەها لە خوتبەی ڕۆژانی هەینیدا لە دوای ناوی خەلیفە ناویان دەبراو و دوعایان بۆ دەکرا، ئەم دوو هەنگاوەش نیشانەی ئەوەبوون کە ئەو میرانە خۆیان بە فەرمانڕەوای سەربەخۆ دەزانی.

ئەم بارودۆخە بەردەوام بوو تا لە نیوەی دووەمی سەدەی پێنجەمی کۆچی/ یانزەهەمی زایینی، هەرێمە کوردنشینەکان و سەرجەم هەرێمەکانی رۆژهەڵاتی ئیسلامی دووچاوی هێرش و پەلاماری فراوانخوازیانەی تورکە سەلجوقیەکان بوونەوە بە سەرکردایەتی توغرل بەگ و ئەلب ئەرسەلان و مەلکشا و یەکێك لە ئەنجامە خراپەکانی ئەم لەشکر کێشیە، کەوتن ولە ناوچوونی میرنشین و دەسەڵاتدارییە ناوخۆییەکانی کوردستان بوو، لە لایەکی دیکەوە گەلێك هۆزو تیرەو بەرەبابی تورك و تورکمان بە کوردستاندا بڵاوبوونەوەو بە یەکجاری نیشتەجێ بوون، دواتر لە سەدەی شەشەمی کۆچی/ دوازدەهەمی زایینی لە ژێر سایەی هاندان و پشتگیری سەلجوقیەکان توانیان ژمارەیەك دەسەڵاتداری لە سەر خاکی کورد دابمەزرێنن کە لە مێژوودا بە ((ئەتابکیات)) ناو دەبران.

**میللەتـی کـورد لـە سـەدەکانی ناوەڕاسـتدا لـە رووی جـۆری ژیـان و بـاری گوزەرانـەوە بەسـەر سێ کۆمەڵـدا دابـەش دەبـوون:**

### ١- شارنشینەکان:

ڕێژەیـەك لـە میللەتـی کـورد و دانیشـتوانی دیکـەی کوردسـتان لـە شـارو باژێـڕو شـارۆچکەکان دەژیـان و بـەکاری بازرگانـی و دوکانداری و پیشەسازی جۆربەجـۆرەوە خەریـك بـوون وەك ئاسـنگەری، دارتاشـی، زێڕنگـەری، کوتاڵفرۆشـی، جۆلایـی، دەرمانسـازی، کرێـکاری... هتـد.
هەندێکیشـیان لـە فەرمانگەکانـدا فەرمانبـەر بـوون، لـەو دەمانـە ژمارەیـەك شـارو باژێـری ئـاوەدان و قەرەبالـغ و پـڕ جموجـۆڵ هەبـوون، لـە وانـە: ئەربیـل (هەولێـر) سـنجار، حلـوان، ئامـەد، میافارقیـن، حوسـنکێفا، سـەعرت، بەدلیـس، دەینـوەر، کرماشان(قرمسـین) شـاپور خواسـت. داقـوق، سـەلماس، ئورمیـە، شـنۆو چەندینـی تـر، لـەم شـارانە لـە پـاڵ کـورد. میللەتەکانـی ئەرمـەن، سـریان، جولەکـە دەژیـان کـە زیاتـر پیشـگەری و ، پارەگۆڕینـەوە، بازرگانیـان دەکـرد. ئەمـە وێـڕای بوونـی عـەرب و تورکمـان کەهاتبوونـە شـارە کوردییـەکان و تێیـدا نیشـتەجێبون.

### ٢- گوندنشینەکان:

لـە ڕاسـتیدا زۆربـەی دانیشـتوانی کوردسـتان لـە گونـدو شـا ودێ و لادێکانـدا گیرسـابوونەوە، هـەزاران گونـدو لادێـی گـەورەو بچـووك هەبـوون، دەگمـەن پانتاییەکـی جوگرافـی هەبـوو گونـدی لێنەبـێ، وەکـو زانـراوە ئاو هەواو کەشـی زۆربـەی هـەرەزۆری دەڤەرەکانـی کوردسـتان گونجـاو ولـە بـازن بـۆ چانـدن و ژیانـی وەرزێـری، وەك ئاشـکرایە گوندییەکانـی بـە ئاژەڵـداری و جوتیاریـەوە خەریکبـوون، جۆرەهـا ئاژەڵـیماڵیـان بەخێـو دەکـرد لـە پـەز (مـەڕ ) بـزن، چێـڵ، گا پەلـەوەر، هـاوکات گونـدو لادیـکان شـارو باژێـرەکان سـەرچاوەی دابینکردنـی هەمـوو چەشـنە بەروبوومێکـی کشـتوکاڵی وئاژەڵـی بـوون.

### ٣- كۆچەری و نیمچە كۆچەری (ڕەوەند):

تا ئەم ساڵانەی دواییەش ژمارەیەك خێل و تیرەو بنەماڵەی كورد ساڵانە گەرمیان و كوێستان (واتە باكوور و باشوور) یان دەكرد و وێڵی دوای لەوەڕگا بوون، دەمەو پایزان لە هاوینگەكان (باكوور)ەوە بە پەزو مەڕ و ماڵاتەوە دادەكشانە پێدەشتە گەرمەكان و ناوچە گەرمەسێرەكان و دەمەو بەهاریش لەگەڵ هەوا خۆشبوون بارگەو بنەیان تێك دەنا وبەرەو كوێستان و زۆزانەكان هەڵدەكشان لە بناری چیا سەر كەشەكانو لە قەد پاڵی زنجیرە شاخە بەرزەكاندا، دەیان لەوەڕگە و زۆم و هەبوون كە بەدرێژایی هاوین پڕ گیا پۆش پەلاش ولەوەڕبوون، هەر بۆ نموونە لەسەدەكانی ناوەڕاستدا هۆزی كیكانی لە زستاندا لە دەشتاییەكانی دەوروبەری موسڵدا ڕەشماڵی دەخست وەرزی سەرماو سۆڵەی بەسەر دەبرد، بەهارانیش ڕووی دەكردە هەرێمی زۆزانی بەفراوان شان بە شانی سەدان خێل و تیرەی كۆچەری تردا هاوینی لە وەرگاكاندا دەگوزەراند، بەهەمان شێوە، خێلی ڕەوەند(ڕەوادی) كۆچەریش كە لقێكی هۆزی مەزنی هەزبانیە، زستانانی لە دەشتی هەولێر و كەناری زێدا بەسەر دەبرد، هاوینیش لە هاوینگەكانی چیاكانی كێلە شین و دەوروبەریدا دەمایەوە.

لە ڕووی پێكهاتەی كۆمەڵایەتییەوە، میللەتی كورد وەك گشت میللەتانی تری جیهانی ئیسلامییەوە بەسەر لە ڕووی پێكهاتەی كۆمەڵایەتییەوە، میللەتی كورد وەك گشت میللەتانی تری جیهانی ئیسلامییەوە بەسەر چەند هۆزو خێل وعەشیرەتدا دابەش دەبوو، بەڵام تەنها ناو و هەواڵی ژمارەیەكی كەمیان لە سەرچاوە مێژووییەكاندا هاتووە، هەریەكێك لەو هۆزو خێل و عەشیرەتانە لە رووی جل پۆشین و دابونەریتی كۆمەڵایەتییەوە ئاخافتنەوە كەم تا زۆر لەوانی تر جیاواز بووە، هۆزە ناسراو و دێرینەكانی كوردستان بریتین لە:

لەولاتـی شـارەزوور و گـەرمیـان: جەلالیـی (گەلاڵـی)، بەرزەکانـی، شـازنجانی، گـۆران (الجورقـان)، باپیـری، لاوێنـی.
لە خواروی کوردستان: گاوانی (الجاوانیه) بەتیرە وخێڵەکانیانەوە:
بەشیری، نەرگسیەت (النرجسیه)، زوهەیری، هەواری.
لـە هەولێـرو دەوروبـەری: هەزبانـی کـە چەنـد خێـڵ وتیـرەی هەبـوو تەنهـا دووانیــان ئاشــکران ئەوانیــش مارانــی و رەوادی(رەوەنــدی)ن.
لـە هەرێمـی جەزیـرە: زەرزاری، گـەردی (کەرتـاوی)، سـۆرانی، حەکەمـی لـە ولاتـی داسـەن وئاکـری هـەکاری ، دامەنـی، مەهرانـی، روهـزادی، یەعقوبـی، حەمیـدی، مازنجانـی، کیکانـی، دونبڵـی، گـۆران.
لـە کوردسـتانی باکـوور: بوختـی (بۆتانـی)، بەژنـەوی، زۆمی، چۆپـی، رۆژەکی، قەیمـوری، کوردەکی، شـێروانی، مەحمـوودی، پازۆکی.
لـە هەرێمـی لوڕسـتان و خـو رووی هەرێمـی چیـا: تیـرەو خێلەکانـی هـۆزی لـوڕ، رۆژبەیانـی، لـەك، فەیلـی، بەختیـاری، مامسـانی، سـاکی، مامۆیـی...

## پرسیار

١- قۆناغەکانی مێژووی کوردو کوردستان دەستنیشان بکە.

٢- پێناسەی چەمکی سەدەکانی ناوەڕاست بکە.

٣- ناوی هەشت هۆزی کوردو هەشت شاری کوردستان بێنە.

٤- گوتارێکی کورت، دەربارەی هۆزە کۆچەرو نیمچە کۆچەرەکانی کوردستان لە سەدەکانی ناوەڕاست، بنووسە.

## سەرچاوەو ژێدەر


- ابن الأثیر، الکامل فی التأریخ
- حمد الله المستوفی، تاریخ طزیدة.
- محمد أمین زکی، مێژووی کوردو کوردستان

## بەندی دووەم: شارستانییەتی میرنیشینە کوردییەکان

میرنیشین و دەسەڵاتداریە کوردییەکان لە چوارچێوەی جیهانی ئیسلامیدا هەموویان شارستانییەتی تایبەتی خۆیان هەبووە هەریەکەیان بە گوێرەی هەلومەرجی سیاسی و ئابووری ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی و تواناو شیانی خۆی بەشداری کردووە لە بناغە دارشتن و پێشخستنی شارستانییەتی کورد، بۆ نموونە لە هەندێك لایەنی ژیانی شارستانی هەردوو میرنیشینی حەسنەوی و دۆستەکی- مەروانی و دەوڵەتی ئەیوبە دەدوێن.

### ١- شارستانییەتی میرنیشینی حەسنەوی (٣٤٨-٤٠٦ کۆچی/ ٩٥٩ ١٠١٥ زایینی):

میر بەدر کوڕی حەسنەویە (٣٦٩- ٤٠٥کۆچی/ ٩٧٩- ١٠١٤زایینی)، یەکێکە لە دیارترین و ناسراوترین کەسایەتی کورد لە سەدەکانی ناوەڕاستدا و بە جوامێری و نەبەردی و ئایینداری و گەلپەروەری ناوبانگی دەرکردبوو، سەرچاوەکان دەربارەی ئەم ئەدگارو خەسڵەتانەی دواون زۆر ستایشیان کردوە. میر بەدر لە بواری سیاسەت و فەرمانڕەواییدا، کەسایەتیەکی ئازا، دلێر، بوێر، چەلەنگ و دووربین بوو، لە بواری مرۆڤایەتیشدا دادپەروەر. خواناس، خێرخواز و بەرچاوتێر، سینگفراوان و راستگۆ بوو، هەموو ئەو ئەدگارو رەوشتانەی تێدا بوو کە پێویست بوو لە کەسایەتیەکی کاربەدەست و بەرپرس دا هەبێت.

لە سۆنگەی کەسایەتی شایستەو سەرکەوتووی میر بەدرەوە، لەو بەشەی کوردستان بارودۆخی نائاسایی و ئاڵۆز برایەوە ناسەقامگیری و گرژی سیاسی تا ڕادەیەکی باش رەویەوە و تەناهی و ئارامی هاتنە کایەوە.

ئەوەی گومانی تێدا نییە، لە هەموو سەردەم و چەرخەکان و لە گشت هەرێم و وڵاتی جیهان رەوشی سیاسی جێگیر و هێمن و بەدەر لە گرژی و ئاڵۆزی، مەرج و فاکتەرێکی بنەڕەتی بووە بۆ دەستەبەرکردنی شارستانییەت و ژیاری و بوژاندنەوەی ئابووری و کاراکردنی چالاکیە کشتوکاڵی و پیشەسازی و بازرگانییەکان و بە گەڕخستنی کاری بیناسازی و ئاوەدانکردنەوە و هاندانی

بزاڤـی رووناكبیـری و بیرمەنـدی و خوێنـدەواری، لێـرەوە بەڕاشـكاوی تێبینـی دەكرێـت لـە ڕۆژگاری میـر بـەدردا، كەشـو هـەوای لەبـارو گونجـاو دابیـن كـراو شارسـتانییەتی ناوچەكـە بەڕادەیەكـی بـەرز پێشـكەوت، ئەوەبـوو چالاكـی ئابـووری و بازرگانـی بـرەوەی سـەند و پرۆسـەی فێركردن و رۆشـنبیری و زانسـتی گوڕوتینـی تێكـەوت و هەڵمەتـی بنیاتنـان و ئاوەدانـی دەسـتی پێكـرد و سـەرجەم شـارو شـارۆچكە و گونـدو لادێكانـی وڵاتـی شـارەزوو و هەرێمی چیـای گرتەوە.

## أ- بیناسازی:

میـر بـەدر بایەخێكـی سـەرەكی بەبـواری بیناسـازی و ئاوەدانكرنـەوە دەدا وەك دیاردەیەكـی جوانـی و پێشـكەوتنی سـەیری دەكـرد و سـەرمایەكی زۆری لـە بودجـەدا بـۆ تەرخـان كردبـوو، نەخاسـمە بنیاتنانـی مزگـەوت بـەو پێیـەی دەبێتـە شـوێنی نوێژكـردن و خوداپەرسـتی لەپـاڵ ئاواكردنـی دەیـان خانـە و خانەقـاو دامـەزراوەی خزمەتگـوزاری و خێرخـوازی، دەقـە مێژووییـەكان دەگێڕنـەوە كـە میـر بـەدر پتـر لـە دوو هـەزار مزگەوتـی بنیاتنانـەوە لـە سنوری جوگرافـی ژێـر دەسـەڵاتیدا، وەك ئەوانـەی لـە شـارەكانی دینـوەرو كرماشـان و برۆجـەرد بەرچـاو دەكـەون كـە هەندێكیـان تـا رۆژگاری ئەمـڕۆش مـاون پـاش دەسـتپێداهێنان و نوێژنكردنەوەیـان.

- دەیـان زانـاو شـارەزای ئایینـی كـورد كـە بەهەرێـم و وڵاتـی جیهانـی ئیسـلامیدا بڵاوبوونـەوەو ناوبانگیـان دەركـرد، قۆناغـە بەراییەكانـی خوێنـدن و فێربوونیـان لـە قوتابخانـە پاشـكۆكانی ئـەم مزگەوتانـە تەواوكـرد.

- هەروەها میر بەدر لەسـەر ڕێگەوبانە گشـتییەكاندا، ژمارەیەك وێسـتگەی پشـوودان و مانـەوەی دروسـتكردبوو خەڵكانـی بـازرگان و ڕێبـواران و هاتـوو چۆكـەران سـوودیان لێدەبینـی، ئـەم وێسـتگانە لـە تـەك مزگـەوت و خانەكانـدا دەبوونـە جێگـەی مانـەوەو بیهنڤەدانـی كەسـانی لانـەواز و غەریـب و بێدەرەتـان و كەمدەرامـەت و بـۆ هەمـوو لایـەك پێداویستییەكان دابیـن دەكـران لەجـل و پۆشـاك و نوێـن و خـواردن و خواردنـەوە.

- لەلایەكـی تـرەوە هـەر وەسـتاو بیناكاری كارزانی كـورد بوون رادەبوون

بـه دروسـتكردنی مزگەوتـەكان و دامـو دەزگا خزمەتگوزارییەكانـی تـرو كۆشـك و تـەلارە فەرمییەكانـی میرنیشـینی حەسـنەوی و بـارەگای میـر بـەدر و میرانـی دی و هونـەری بینـاكاری كوردەواریـان لـە دروسـتكردندا پەیـڕەو دەكـرد كـە هەرچەنـد لـە بازنـەی هونـەری بیناسـازی ئیسـلامی دەرنەدەچـوو، بـەڵام مۆركـی ڕەسـەنی خۆماڵیـان پێـوە لكابـوو و جۆرێـك لـە تایبەتمەنـدی پێبەخشـیبوو و دەكرێـت لەسـەر بناغـەو پاشـماوەی ئـەم مزگـەوت و دامەزراوانـە لـە مێـژووی گەشـەكردنی هونـەری بیناسـازی بكۆڵینـەوە.

## ب- سیستەمی دارایی:

میرنیشـینی حەسـنەوی هەرچەنـدە پابەنـدو لایەنگیـری خەلافەتـی عەباسـی بـوو دەسـەڵات و سـەروەری خەلیفە بەسـەریەوە باڵادەسـت بـوو و میرەكانـی گوێڕایـەڵ و ملكەچـی فرمـان و بڕیارەكانـی بـوو و بەهێمـای دەسـەڵاتی شـەرعییان دادەنـا، بـەڵام لـە ڕووی داراییـەوە پەیوەندیەكـی ئەوتـۆی بـە خەلافـەوە نەبـوو و خـاوەن سیسـتەمی دارایـی و خەزێنـەی تایبەتـی خـۆی بـوو سـەربەخۆیی دارایـی میرنیشـینی حەسـنەوی لـەوە خـۆی دەنوانـد كـە میـر بـەدری كـوری حەسـنەویە هەنگاوێكـی بوێرانـەی هاوێشـت و هەڵسا بـە لێـدان و دروسـتكردنی دراو كـە وێـڕای نـاوی خەلیفـەی عەباسـی و نـاوی فەرمانڕەوایـی بوەیهـی و نـاوی خۆیشـی لەسـەر نەخشـاند، ئـەم هەنـگاوە بـە دابـی سـەدەكانی ناوەڕاسـت وا لێكدەدرایـەوە كـە میـر بـەدر هەرچەنـدە دان بـە دەسـەڵاتی ڕووحـی و ئایینـی خەلیفـە و دەسـەڵاتی سیاسـی میـری بوەیهـی دەنێـت، هـاوكات لـە دەڤەرەكانـی ژێـر قەڵەمڕەوییـدا خـۆی بەكاربەدەسـتێكی سـەربەخۆ دەزانێـت.

میـر بـەدر لـە مـاوەی فەرمانڕەواییـدا چەندیـن دینـاری زێڕیـن و درهەمـی زیوینـی بەنـاوی خۆیـەوە لێـداو ولـە ناوخـۆی وڵاتـدا كـراوە بـە دراوی فەرمـی و لەپـاڵ دراوە باوەكانـی تـردا بەكارهێنـراوە، نموونـەی ئـەم دراوانـەش تـا ئەمـڕۆش هـەر مـاون و لـە مۆزەخانەكانـدا هەڵگیـراون.

### ج- بازرگانی:

ئارامی و هێمنی ناوچەکانی ژێر رکێفی میرنیشینی حەسنەوی و دەوڵەمەندی شار و دێکانی بەکاڵا و بەرهەمی کانزایی رووەکی جۆر بەجۆر و رێکخستنی رێگاو، بانەکان کارێکی وایان کرد جموجۆڵی بازرگانی چالاکی بێت و پرۆسەی ئاڵوگۆڕی بازرگانی و هاتن و چوونی کاروانچیان بە ئاسانی و دوور لە هەڕەشەو مەترسی ئەنجام بدرێت، هەروەها میرنیشینەکە دەکەوتە سەر رێگەی نێودەوڵەتی بەغدا- خۆراسان کە بە رێگای (خورسان) دەناسرا و عێراقی گرێدەدا بە هەرێمەکانی رۆژهەڵاتەوەو هەرگیز هاتوچۆ و ڕایەڵەی بازرگانان و ڕێبوارانی لێنەدەبڕاو داهاتێکی باشی بۆ هاووڵاتیانی حەلوان(ئەلوەند) و دەرتەنگ و سەرپێڵی زەهاو مسۆگەر دەکرد، ئاسایش ئەم رێگا زیندووە و پاراستنی گیانی کاروانچیان لە چەتەو رێگران، تەنها بەسەرداران و سەرۆك هۆزە کوردەکان دابین دەکرا، بۆیە کاربەدەستانی بوەیهی ناچار ڕاپەڕاندنی ئەم کارەیان بەسەرۆکی هۆزی شازەنگانی سپارد، هەروەها تۆڕێك لە هێڵی ناوخۆیی شاروگوندەکانی میرنیشینەکەی بەیەکەوە دەبەستەوە، دانیشتوان لە هێنان و بردنی بەروبووم و کەلوپەلەکانیاندا کەڵکیان لێ دەبینی.

راستیەکی بەڵگە نەویستە کە چالاکی بازرگانی پێویستی بە هەبوونی بازاڕە، واتە شوێنی دیداری کڕیارو فرۆشیار و ئەنجامدانی ئاڵوگۆڕ و کڕین و فرۆشتن، زۆری بازاڕ لە وڵاتێك نیشانەی گەرموگوڕی بازرگانییە لەو وڵاتەدا، لە میرنیشینی حەسنەوی شارو شارۆچکە نەبوو بازاڕێك یان زیاتری لێنەبێت، بۆ نموونە لە دەینوری پایتەخت و شارەکانی قرماسین (کرماشان) و ئەسەد ئاباد و بەندینجین (مەندەلی) چەند بازارو گوزەرێکی ئاوەدان هەبوو، کەچی لە شاری حلوان تەنها بازاڕێکی درێژ بەرچاو دەکەوت، ئەمەو جگە لە بازاڕی بچووك و کاتی کە لە بۆنەکان یان لە ماوەیەکی دەستنیشان کراودا دادەنران. ماوەتەوە بڵێین کە لەکاتی ئاواکردنی بازاڕەکاندا ڕەچاوی ئەوە دەکرا کە دەبێت لە ناوەندی شارو نزیك مزگەوتی سەرەکی شارەکە بێت.

## پرسیار

- راپۆرتێك ئامادە بكە سەبارەت بەژیان و كارەكانی میر بەدری كوڕی حەسنەویە.

- سوود و بایەخی رێگای بازرگانی و بازاڕ لە كاری بازرگانیدا چییە؟

- جاران مزگەوت وێڕای نوێژكردن چ ڕۆڵێكی تری دەگیرا؟

- پێناسەی دراو بكە.

## سەرچاوەو ژێدەر


١- المقدسی، أحسن التقاسیم في معرفة الاقالیم.

٢- ابن كثیر، البدایة و النهایة في التأریخ.

٣- الدكتور حسام الدین علي غالب النقشبندی، الكرد في الدینور و شهرزور،، نامەی ماستەر، زانكۆ بەغدا، كۆلیژی ئاداب ١٩٧٥.

## ٢- شارستانییەتی دەوڵەتی دۆستەکی- مەروانی (٣٧٢-٤٧٨کۆچی/ ٩٨٢- ١٠٨٥زایینی):

دەوڵەتی مەڕوانی لە دەوروبەری ساڵی (٣٧٢ کۆچی/ ٩٨٢ زایینی)، لەلایەن میر بادی کوڕی دۆستەکی حاربوختیەوە دامەزراوە کە لە بنەماڵەیەکی خێڵی حاربوختی سەر بە هۆزی بوختی (بوختانی) یە لە هەرێمی جەزیرە لە باکووری کوردستان.

میرباد لە خێزانێکی ساماندار دەست ڕۆیشتوو نەبوو، کوڕی سەرەك هۆزو دەرەبەگ نەبوو، لە ڕۆژانی منداڵی و گەنجێتی شوانی مەڕان بوو، بەڵام مرۆڤێکی بەخشندەو لاوچاك و جوامێر بوو، هەر لەسەرەتاوە نیشانەو ئەدگاری پیاوەتی و چاو نەترسی و جەربەزەیی لێ بەدی دەکرا، هاریکاری نەدارانی دەکردو بەدەنگیانەوە دەچوو، لە خاڵە سنوورییەکانی دەوڵەتی ڕۆم جەنگ و غەزای دەکرد، خەڵکی خۆشیان ویست و لە دەوری کۆبوونەوە پشتیوانیان لێکرد، تاشیا شاری ئەرگیش لە باکووری دەریاچەی وان بگرێت و لە ماوەیەکی کەمدا شارەکانی حوسنکێف، میافارقین، جزیرەی بۆتان، نووسەیبین خستە ژێر ڕکێفی خۆیەوە و قەوارەیەکی سیاسی بەهێزی پێکەوەنا.

میرباد لە شەڕێکدا لە نزیك شاری موسڵ لەگەڵ حەمدانیەکان لە ساڵی ٣٨٠کۆچی/٩٩٠زایینی کوژرا، خوارزەکانی، ئەبوعەلی و سەعید کوڕانی مەڕوانی کوڕی کاك سەرکردایەتی پاشماوەی سوپاکەی خاڵیان کرد کشانەوە بو حوسنکێفا، بارەگای ئەو دەمەی میرنیشینەکە، کوڕو نەوەکانی مەروانی کوڕی کاك درێژەیان بە دەسەڵاتدا و بۆیە ئەم دەوڵەتە لەسەرچاوەکاندا بە مەروانی دەناسرێت، تا لە نیوەی دووەمی سەدەی پێنجەمی/ یازدەهەمی زایینی وەك گشت میرنیشینەکانی کوردستان بووە ئامانجی لەشکرکێشی و فراوانخوازی دەوڵەتی سەلجوقی و لە ساڵی ٤٧٨کۆچی/ ١٠٨٥زایینی لەناوچوو.

لەنێوان میرانی دەوڵەتی مەڕوانی، میر ئەحمەدی کوڕە بچووکی مەروان،

مەزنترین بەرچاوترین میری مەڕوانی و سەرجەم میرنیشینەکانی کوردستانەو زیاتر لە نیو سەدە (٤٠١- ٤٥٣ کۆچی/ ١٠١١-١٠٦١ زایینی) حوکمی کردوە و لەسەر ئاستی رۆژهەڵاتی ئیسلامی کەسایەتیەکی ناسراوو ڕێزدار بوو، جێگەی باوەڕو ستایشی خەلیفەی عەباسی سونی لە بەغدا و خەلیفەی فاتیمی شیعە لە میسر بوو، هەریەکەیان هەوڵی دەدا بۆ لای خۆی رایکێشێ، لە رۆژی دەست بەکاربوونیدا نوێنەری باڵای هەردولایان لەگەڵ وەفدی دەوڵەتی بێزەنتی بە کۆمەڵێ دیاری و بەخشی و ناز ناوەوە لە پایتەخت ئامادە بوون بە نیازی پیرۆزبایی و دەربڕینی رەزامەندی و خۆشحاڵی دەوڵەتەکانیان، نوێنەری خەلیفەی عەباسی نازناوی (نصر الدولة و عمادها)ی بۆ هێنا بوو، نوێنەری خەلیفەی فاتمیش نازناوی (عزالدولة و مجدها) پێبەخشی میر ئەحمەدی کوڕی مەڕوان کە خۆی و بنەماڵەکەی سوننە بوون، خۆی بەلایەنگری خەلیفەی عەباسی سوننی داناو نازناوەکەی ئەوی هەڵبژاردو لە مێژوودا بە ((نصر الدولة)) ناوبانگی دەرکرد.

دەوڵەتی مەروانی لە سنورو چوارچێوەی میرنیشینێتی تێپەڕی بەهێزتربوو و هیچی لە دەوڵەتانی تر کەمتر نەبوو، چەندین دامەزراوی شارستانی و خزمەتگوزاری تایبەتی خۆی بوو، کاربەدەستان لێبڕوانە بایەخیان بە پێشخستنی وڵات و خزمەتکردنی هاووڵاتیان دەدا، بۆیە هەرێمی جەزیرە واتە باکووری کوردستان لەسەردەمی مەڕوانیدا لەهەموو روویەکەوە بواژاندنەوەی بەخۆوە دیت، ژیانی ئابووری بوژایەوە، هەڵمەتی بنیاتنان و ئاوەدانکردنەوە دەستی پێکرد چالاکی رۆشنبیری و زانستی و هونەری برەوی سەند، سەرچاوەکان هەوڵ و دەنگ و باسی ئەم پێشکەوتنە گشتگیرو وفرە لایەنانەی پاداشت کردووە، لێرە بەکورتی هەندێك لایەنی پڕشنگداری، دەخەینە روو.

## أ- پیشەسازی:

هەرێمی جەزیرە لە ڕۆژگاری مەڕوانیەکاندا، بوژانەوەیەکی پیشەسازی گەرمی بەخۆوە دیت، باژێڕەکانی ئامەدو حوسنکێف و میافارقین و سعرت و ئەرزن بوونە مەڵبەندی چەندین کارخانەی بەرهەمهێنانی کاڵاو کەلوپەلی جۆربەجۆر، لە ڕاستیدا کاربەدەستانی مەڕوانی کار ئاسانیان بۆ توێژی پیشەکاران دەکردو کەشی لەباریان بۆ دەرەخساندن و پێویستییەکانی ڕاپەڕاندنی کارەکانیان بۆ دابین دەکردن، هەروەها جەزیرە هەرێمێکی دەوڵەمەندە بەکەرستەی خاو و ئەو کەلوپەلانەی دەبنە بابەتی سەرەکی پرۆسەی دروستکردن. چ کەرەستەی کشتوکاڵی و بەرهەمی ئاژەڵی لە پەموو و کەتان و ئاوریشم و ڕووەکی سروشتی و گژوگیای کێوی و میوەجات و دارستان و پێستە و خوری و مەرەز، چ کەرەستەی کانزایی لە ئاسن و مس و زێڕو کبریت و جیوە و قورقوشم و زەرنیخ و بەردو کەڤرە کانزاییەکان. تێبینی دەکرێت پتر ئەم پیشەسازییانە باو بوون، جلو بەرگ و کوتاڵ، مافورو کومبارو نەخشاندن، ئاسنگەری دەرگاو پەنجەرەو ئامێرەکانی چاندن و جوتیاری و چەك و تەقەمەنی لە شیرو تیرو کەوان و خەنجەرو چەقۆ، پیشەسازی خواردەمەنی و جوانکاری لە شەربەتی مێووژو ئاوی هەنارو وشکردنەوە مێوەی هەنجیرو ترێ و گوڵاو و بۆن و سابون. ڕێژەیەك لە بەرهەم و کەلەپەلی دروستکراو بازرگانی پێوە دەکراو دەنێردرایە دەرەوەی هەرێمی جەزیرەو و ڕەوانەی وڵاتی شام و ئەرمینیا و ئازەربایجان دەکراو لە بەرانبەردا بازرگانەکان کاڵاو شتومەکی دیکەیان پێدەکڕی و دەیان هێنایە ناوەوەی دەوڵەت، هەروەها ئاڵوگۆڕێکی بازرگانی بەردەوام لە ئارادا بوون لە نێوان دەوڵەتی مەڕوانی و ئیمپراتۆریەتی بێزەنتینی لە ڕۆژئاوا.

بزاڤی پیشەسازی مەڕوانی لەم سنوورە نەوەستا و تەنها ئەو بارانەی نەگرتەوە کە داواکاری و پێویستی ڕۆژانەی مرۆڤ بوون بگرە هەنگاوی پێشکەوتووی هەڵناو گەیشتە قۆناغی کاری میکانیکییەوە کە هونەرو تەکنەلۆژیای زانستی گەردووناسی تیادا بەکار دەهێنراو کەسانی کارامەو شارەزا پێی هەڵدەستان، گرینگترینیان ئەو کارە میکانیکیانە بریتییە لە دروستکردنی کاتژمێری بەنگام.

## - کاتژمێری بەنگام:

دروستکردنی کاتژمێری بەنگام بە لوتکەی داهێنان دەژمێردرێت لە وەستایی و کارسازی کوردی سەدەکانی ناوەڕاست و بە دەستپێشخەریەکی زانستی بێوێنە دادەنرێت لە مێژوودا، چونکە داهێنانی شاکارێکی لەو بابەتە تا ئەو دەمانە لە رۆژهەڵاتی ئیسلامیدا کارێکی دەگمەن بوو.

ئەم کاتژمێرە بەفرمان و سەرپەرشتی میر(نصر الدولە) ئەحمەدی کوڕی مەڕوان لە مزگەوتی گەورەی شاری میفارقینی پایتەختی دەوڵەت دروستکرابوو، بەڵام مخابن بە دڵنیاییی نازانرێت کام تەکنیککاری دەستڕەنگین ئەم کارەی ئەنجام داوە.

وا دیارە کاتژمێرەکە بە بزوتنی ئاو یان مۆمی تواوە یان چەند ئامێرێکی میکانیکی دەکەوتە گەڕ و ئیشی دەکرد و پێوەری بیرکاری و گەردووناسی بۆ دانرابوو و گرێدرابوو بە جولانەوەی خۆرو قۆناغەکانی سوڕانەوەی مانگ. بێگومان دروستکردن و داهێنانی ئامێرێك لە چەشنی کاتژمێری بەنگام کاریگەریەکی قووڵ و وەرچەرخێنەرانەی کردۆتە سەر پیشەسازی میکانیکی لەسەر پاکی هەرێم و وڵاتانی ناوچەکەو ئەم سەروەریەش لە مێژوودا بۆ دەوڵەتی دۆستەکی- مەروانی تۆمار دەکرێت.



کاتژمێری بەنگام

## ب- چالاکییه ڕووناکبیرییەکان:

میران و بەرپرسانی مەڕوانی درکیان بەڕۆڵ و گرنگی و سوودی خوێندەواری و ڕووناکبیری دەکرد لە پێشخستنی کۆمەڵگادا، میر (نصر الدولة) بەخۆی ئەدەب و دۆست و ئارەزوومەندێکی بە پەرۆشی زانست و هونەر بوو، بەڕادەیەکی سەرنجڕاکێش بایەخی بە مرۆڤی زاناو نووسەر و فێرخواز دەداو لە خۆی نزیکی دەکردنەوە و بە بەخشش و دیاری موچە هاریکاری دەکردن و هانی دەدان. چ پێداویستی و داواکارییەکان هەبوایە، بۆیانی جێبەجێ دەکرد، جێگەی لە بارو شایستەی بۆ خوێندن و فێربوون و کەرەستەی نووسین و دانانی بۆ دابین دەکردن. مێژوونووسان دەگێڕنەوە کە دەربارەی میر(نصر الدولة) بوبووە مەکۆی زانست و ئەدەب و مەعریفەت و مەڵبەندی گردبوونەوە و پێگەیشتنی زانایان و شاعیران و هونەرمەندان و ئەدیبان کە لەگشت لایەکەوە ڕوویان تێدەکرد و بەکەش و هەوای زانستی شیاو و ڕەخساو گوشاد دەبوون.



مزگەوتی مەڕوانیەکان لە شاری ئامەد(دیاربەکر) لە ساڵی ٤٤٧کۆچی ١٠٥٥ زایینی بە بڕیاری میر( نصر الدولة) ئاوا کراوە.

ئەنجامێکی دیکەی هاندان و بایەخدانی میر(نصر الدولة) لەوە ڕەنگی دایەوە کە وەچەیەك لە فەقێ و شاعیرو نووسەری کورد دەرکەوتن کە لە دەرچووانی مزگەوت و حوجرەکانی شاروشارۆچکەکانی ئامەد، میافارقین و حوسنکف و تەنزەو جزیرەی بۆتان و هێزان و ئەرزن وشاتان و فەنەك بوون و پشکداریيان کرد لە گەشەپێکردن و درێژەپێدانی شارستانییەتی دەوڵەتی مەڕوانی و بوونە هەڵگری پەیامی بڵاوکردنەوەی خوێندەواری و فێرکردن لە کوردستانداو پێگەیاندنی نەوەی پاش خۆیان لەوانە:

١- شاعیرو تۆرەڤان(ئەدەبناس) حوسێن کوڕی داودی بەژنەوی.

٢- فەقیهی شافیعی شێخ محەممەدی کوڕی فەرەجی فاریقی.

٣- شاعیرو زمانەوان ئەبوعەلی حوسێنی کوڕی سەعدی ئامەدی.

٤- مامۆستاو وتارخوێن و شاعیرو زمانزان مەعینالدین یەحیا کوڕی سەلامە حەسەکفی کە بە (وتارخوێنی حصن کیفا)

٥- قازی و فەقیهی شافیعی حەسەنی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی عەلی فارقی (٤٣٣-٥٢٨کۆچی/ ١٠٤٢- ١١٣٤زایینی). قازی شاری واست (کوت) لە عێراق و خاوەن پەرتووکی (الفوائد علی المذهب).

## لە مێژووی ڕووناکبیری دەوڵەتی مەڕوانی، سێ کەسایەتی ڕۆڵی مەزن و سەرەکیان هەبووە ئەوانیش:

### ١- شاعیر و تۆرەڤان حوسینی کوڕی داودی بەژنەوی (٤٦٥کۆچی/ ١٠٧٢زایینی):

حوسینی کوڕی داود کە لە سەدەی پێنجەمی کۆچی/ یازدەهەمی زایینی ژیاوە و هاوچەرخی میر (نصر الدولة) بوو، لە هۆزی بەژنەویە کە بە جوامێری و خانەدانی ناوی دەرکردبوو، لە مێژوویەکی نادیارا لە قەڵای فەنەك هاتۆتە دنیاوە ئەم قەڵایە بە چەند کیلۆمەترێك دەکەوێتە باکووری جزیرەی بۆتانەوە و لەسەردەمی عەباسی بارەگای میرەکانی بەژنەوی بوو. حوسێنی بەژنەوی شاعیر و نووسەرێکی بەتوانا بوو، دیوانێکی شیعر و

دوو پەرتووكـی دانـاوە، بـەڵام جێـی داخـە هەرسـێكیان بێسـەر و شـوێنن و دوور نییـە لەناوچووبـن. ئـەو ژێدەرانـەی ژیاننامەیـان نووسـیوە چەنـد كۆپلـە شـیعرێكیان لـە دیوانەكەیـەوە وەرگرتـوە و بڵاویـان كردۆتـەوە كـە بریتیـن لـە شـیعری بەرگـری و نیشـتمانی، و سـتایش و پیاهەڵـدان و شـانازیكردن بـە میـر بـادی كـوڕی دۆسـتەك و ماڵباتـی میرانـی هـۆزی بەژنـەوی.
هەندێـك لێكۆڵـەر پێیـان وایـە حوسـێنی بەژنـەوی یەكـەم شـاعیری كـوردە شـانازی بـە میللەتـی كـورد و بنەماڵەكەیـەوە كـردوە.

**٢- شاعیرو نووسەر ئەبوناسری مەنازی (٤٣٧كۆچی/ ١٠٤٥زایینی):**
ئەبوناسـر ئەحمەدی كوڕی یوسـفی مەنازی نووسـەرێكی بەهرەمەندو شاعیرێكی بەتوانـاو هەسـت ناسـك بـوو، لـە شـارۆچكەی مەنازگەرد(مەلازگـرت) نزیـك شـاری خەربـوت لـە دایـك بـووە، بـەردەوام سـەردانی عێـراق و شـامی كـردوەو لـە شـاری مەعـرە چـاوی بـە كەڵـە شـاعیری عـەرەب ئەبـو عەلائـی مەعـڕی كەوتـووەو لـە مـەڕ شـیعر و شـاعیران گەنگەشـەیان كـردوە، شـیعرەكانی سـەرنجی ئەبـو عەلائیـان راكێشـاوە. لەبـەر لێهاتوویـی و زیرەكـی، میـر (نصـر الدولـە) ماوەیـەك كردیـە بەرپرسـی دیوانـی داڕشـتن و پەیامبـەری، ئـەرك و فەرمانـی ئـەم دیوانـە نووسـین و داڕشـتنی نامـەو پەیـام و ناردنـی بـۆ وڵاتانـی دەرەوە بـوو، مەنـازی چەنـد جارێـك بـە كاری فەرمـی چۆتـە قوسـتەنتینیە (ئەسـتامبۆل)ی پایتەختـی دەوڵەتـی بێزەنتـی، پاشـان پۆسـتی وەزیریـی پـێ سـپێردراوە.
مەنـازی دیوانێكـی شـیعری هەبـووە كـە وادیـارە دانـەی دەستنووسـی كـەم بووەو دەسـتی كەسـی نەكەوتـووە، ئـەوەی لـە شـیعرەكانی ماوەتـەوە چەنـد دێرێكـە كـە لـە ئاسـتێكی بـەرزدان و مێژوونووسـان بـەرز نرخاندویانـە. مەنـازی لـە سـاڵی ٤٣٧كۆچـی/ ١٠٤٥زایینـی كۆچـی دوایـی كـردوە.

**٣- ئەبـو نەسـری حەسـەن کـوڕی ئەسـەدی فارقـی (٤٨٧کۆچـی/ ١٠٩٤زاییینـی):**

ئەبو نەسر حەسەنی کوڕی ئەسەدی کوڕی حەسەنی فارقی، کەسایەتییەکی دڵسۆزو نیشتمان پەروەر و نووسەرێکی بە هەڵوێستی شاری میافارقینە، لە سەردەمی دەوڵەتی مەروانیدا. ماوەیەك لێپرسراوی دارایی شاری ئامەد بوو، پاش داگیرکردنی هەرێمی جەزیرە و لەناوبردنی دەوڵەتی مەروانی، ئەبو نەسر چووە ڕیزی نەیاران و بەرهەڵستکارانی دەسەڵاتی سەلجوقیەوە، کاتێکیش سوڵتان مەلیکشای سەلجوقی مردو ناکۆکی کەوتە نێو کوڕەکانییەوە، ئەم هەلەی قۆستەوەو رابەرایەتی بەرەیەکی بەرهەڵستی کرد کە پێکدەهات لەو خوێندکاران و لاوانی میافارقین بە نیازی زیندووکردنەوەی دەوڵەتی مەڕوانی، بۆیە بە بڕیاری تەتەشی سەلجوقی لە ساڵی ٤٨٧ کۆچی/ ١٠٩٤ زایینی لە شاری حەلەب لە سێدارە درا.

ئەبونەسری کوڕی ئەسەدی فارقی نووسەرو پەخشان نووسێکی بە بەخششی و زمانەوان و ڕێزمان نووسێکی هەڵکەوتوو بوو و بەهرەی شیعریشی هەبوو، دیوانێکی شیعرو ئەم پەرتووکانەی هەیە:

- **شرح كتاب اللامع لابن جنى.**
- **الافصاح فى شرح ابيات مشكلة الاعراب.**
- **كتاب الالغاز.**

## پرســـــیار

١- میر بادی کوڕی دۆستەك کێیە؟ چ ڕۆڵێکی بینیوە لە دامەزراندنی دەوڵەتی دۆستەکی؟

٢- کارو پرۆژە ئاواکارییەکانی میر(نصرالدولە) بژمێرە و لەسەر یەکێکیان بدوێ.

٣- ڕاپۆرتێك ئامادە بکە دەربارەی یەکێك لەم ناودارانە (شاعیر حوسێنی کوڕی داودی بەژنەوی، شاعیر ئەبونەسری مەنازی، وتار خوێن یەحیای کوڕی سەلامەی تەنزەیی).

٤- ڕۆڵی ئەبو نەسری کوڕی ئەسەدی فارقی لە بەرەنگاربوونەوەی دەسەڵاتدارانی سەلجوقی چیبوو؟

## ســـــەرچاوەکان


- الفارقی، مێژووی میافارقین و نامەد، وەرگێڕانی: د.قادر محمد پشدەری ئاکۆ برهان (هەولێر:٢٠٠٨)

- ابن الاثیر، الکامل فی التأریخ.

- ابن خلکان، وفیات الاعیان.

- عبدالرقیب یوسف، حضاره الدولة الدوستکیه.

- عمر رضا کحالة، معجم المؤلفین.

### ٣- شارستانییەتی دەوڵەتی ئەیوبی (٥٦٧- ٦٥٨کۆچی/ ١١٧٢- ١٢٦٠زایینی):

دەوڵەتی ئەیوبی لەلایەن سوڵتان سەلاحەدین یوسفی کوڕی ئەیوبی کوڕی شادیی کوردە لە ساڵی ٥٦٧کۆچی/ ١١٧٢زایینی لە میسر دامەزراوە دواتر بەرفراوان بوو و هەرێمەکانی شام و یەمەن و جەزیرەی گرتەوە.

ئەیوبییەکان لە تیرەی رەوادی سەر بەهۆزی بەربڵاوی هەزبانین، شادی کوڕی مەڕوان باپیرە گەورەی میرانی ئەیوبی(قەبری سەلاحەدین ئەیوبی لە دیمەشق) لە سەرەتای سەدەی شەشەمی کۆچی/ دوازدەهەمی زایینی لەسەر بانگێشتی موجاهیدەین بەهرۆزی کۆنە هەڤاڵی کە ئەو دەمە بەرپرسێکی گەورەبوو لە بەغدای پایتەخت، بەخاوو خێزانەوە لە گوندی ئەجندانەقانی نزیك شاری (دوێن)ی هەرێمی ئەرمینیاوە هاتۆتە عێراق و لە قەڵای تکریتی باکووری بەغدا نیشتەجێ بوون و هەر بەفەرمانی بەهرۆزیش پاراستن و بەڕێوەبردنی قەڵای تکریت بەشادی و هەردوو کوڕەکەی ئەیوب و شێرکۆ سپێردرا. دوای ماوەیەك شادی کۆچی دوایی کردو لە تکریت نێژدراو لە ساڵی ٥٣٢کۆچی/ ١١٣٧زایینی یوسفی کوڕی ئەیوب هاتە دنیاوە کە پاشان بەسوڵتان سەلاحەدین ناودار بوو، لەهەمان ساڵدا ئەیوب و شێرکۆ لە سۆنگەی رووداوێکەوە ناچار کران تکریت بەجێ بهێڵن.



قەبری سەلاحەدینی ئەیوبی لە دیمەشق

ئـەوە بـوو روویـان کـردە موسـڵ و پەیوەندیانکـرد بەعیمادەیـن زەنگـی فەرمانـڕەوای موسـڵ و دەوروبـەری، ئەویـش پێشـوازی لێکـردن و ڕێـزی لێنـان و لـە ڕیزەکانـی سـوپاکەیدا دایمەزرانـدن و دواتـر ئەیوبـی براگـەورەی کـردە سـەرداری شـارۆچکەی بەعلەبـەك لـە وڵاتـی شـام.

شـێرکۆ کـە نـاوی ئەسـەدەدینی پێبەخشـرا، لەگـەڵ دەسـت بەکاربوونیـدا لـە سـوپای زەنگـی دلێـری و چاونەترسـی و لێوەشـاوەیی خـۆی سـەلماندوو لەماوەیەکـی کەمـدا کرایـە سـەرکردەیەکی پایـە بـەرزی دەوڵەتـی زەنگـی و هـەر لـە ئاکامـی جەربەزەیـی و سـووربوونی شـێرکۆ سـوپایەکی بچووکـی زەنگی بەسـەرکردایەتی ئـەو توانـی لـە سـاڵی ٥٦٤کۆچـی/ ١١٦٩زایینـی بیابانی سینا ببڕی و قاهیـرەی پایتەختـی خەلافەتـی فاتمـی بگرێـت. پـاش دە مانـگ شـێرکۆ کتوپـڕ کۆچـی دوایـی کـرد، دوای ڕاوێـژو و پـرس و ڕا گۆڕینـەوە راوێـژکارو فەرمانـدە سـەربازییەکان کـە زۆربەیـان کـورد بـوون لەسـەر ئـەوە پێکهاتـن کـە سـەلاحەدین یوسـف جێگـەی مامـی بگرێتـەوە.

## چۆنیەتی دامەزراندنی دەوڵەتی ئەیوبی:

لـە سـاڵی ٥٦٧کۆچـی/ ١١٧٢زایینـی، سـەلاحەدین یوسـف خیلافـەی فاتمـی شـیعی هەڵوەشـاندەوەو دەوڵەتـی ئەیوبـی دامەزرانـد بڕیـاری دا لـە مزگەوتـەکان وتـاری ڕۆژانـی هەینـی بەناوی خەلیفە عەباسـی سـوننی بخوێنرێتـەوە، خەلیفەش لـە پاداشـتی ئـەو هەڵوێسـتەی سـوڵتان سـەلاحەدین سـەرکەوتنەکانی بەسـەر خاچپەرستەکاندا، نازنـاوی (الملـك الناصـر)ی پێبەخشـی.

دامەزراندنـی دەوڵەتـی ئەیوبـی هەرچەنـدە لـە دەرەوەی کوردسـتان بـوو، خاڵێکـی هـەرە مـەزن و بایەخـدارە لـە مێـژووی کـوردو کوردسـتان لەسـەدە ناوەنجییەکانـدا، چونکـە بـووە مایـەی ناوداربوونـی دەیـان هـۆزو خێـڵ و تیـرەو بنەماڵـەی کـورد کـە تـا ئـەو دەمانـە بـە نەناسـراوی گۆشـەگیری مابوونـەوە و خسـتنەگەڕی وزەو توانـاو شـیانیان لـە سـازدان و ئاراسـتەکردنی ڕووداو و بەسـەرهاتە مێژووییـەکان، ئـەم هـۆزو خێـڵ و تیـرەو بنەماڵانـە لـە سـەردەمی ئەیوبییەکانـی هاوڕەگەزیانـدا سـەلماندیان کـە ئەگـەر بۆیـان بڕەخسـێ و هەلـی لەبـارو گونجاویـان بـۆ هەڵبکەوێـت و سـەرکردایەتییەکی خۆییـان هەبێـت، ئـەوا

دەتوانن رووی راستەقینەو شایستەی خۆیان بخەنەڕوو و رۆڵی دروست و نەخشەی کاریگەر بگێڕن لە مێژووی مرۆڤایەتیدا، ئەیوبییەکان لەبەر ئەوەی خۆیان کورد بوون و هەڵقولاوی ناوجەرگەی واقیعی کوردستان بوون، ئەم راستیەیان چاك دەزانی و سەنگ و توانای میللەتی کوردیان بەهەند وەرگرت لە چەسپاندن و پتەوکردنی بنەماو کۆڵەگەی دەوڵەتە نۆبەرەکەیان لەتاراوگەداو لە بەرزکردنەوەی ئاستی زانستی و رۆشنبیری و ولاتی شام و میسردا، بۆیە هەر لەو دەمەوەی کە جڵەوی دەسەلاتیان گرتە دەست، لەلایەك ناردیان بەدوای شەڕکەر و جەنگاوەرانی کورد داوایان لێکرد، خۆ بگەیەننە بەرەکانی شەڕی خاچپەرستانەوە و بچنە ڕیزی تیپەکانی سوپای ئەیوبییەوە لەلایەکی ترەوە هانی خوێندەوارو رۆشنبیرانی کوریاندا کۆچ بکەن بۆ ولاتی شام و میسر و پەیوەندی بکەن بە دامودەزگا زانستی و رۆشنبیریەکانەوە، میرو فەرماندەو سەرداره کوردیەکانیش ئاواتەخواز بوون شەرەفی بەشداری لە جیهادیان پێببڕێت و بێ بەهرە نەبن لەو سەربەرزی و شانازیە، بۆیە کاتێك ئەسەدەدین شێرکۆی مامی سوڵتان سەلاحەدینی سەرکردایەتی سوپای دەوڵەتی زەنگی دەکردو ئالای جەنگی بەرەڤانی و ڕزگاری دژی خاچ پەرستەکان هەڵکرد (دواتریش سوڵتان سەلاحەدین ئەم ئەرکەی گرتە ئەستۆ دەیان میرو فەرماندە و سەرداری کورد بە جەنگاوەران و چەکدارانی هۆزەکانیانەوە: هەکاری، مەهرانی، هەزبانی، زەرزاری، حەمیدی، حەکەمی، داسنی،..هتد خۆیان گەیاندە دەڤەرەکانی شام و میسر و لە ریزەکانی سوپای ئەیوبیدا رێکخران.

هاوکات، سەدان مەلاو میرزا و فێرخوازو خوێندکاری کورد لە ولاتی شارەزوو و جزیری بۆتان و هەولێرو شەنگال و ئورمیەو ئاکرێ و ئامەد و شارەکانی تری کوردستانەوە بە نیازی خوێندن و فێربوون و خۆپێگەیاندن دەستە دەستە روویان کردە حەلەب و دیمەشق و قودس و قاهیرە و ئەسکەندریەو چەندین شاری ترو لەبەردەستی کەڵە زانایانی ولاتی شام و میسردا درێژەیان بە خوێندنداو بوونە وانەبێژو پێشنوێژ و خوتبە خوێن و بانگدەر و لە مزگەوت و قوتابخانەکان دامەزران.

## ١- گرینگییدانـی ئەیوبییـەکان بـە ئاواکردنـی دامـودەزگای زانستی و خزمەتگوزاری:

ئـەوەی جێگـەی سـەرنج و شـایانی ئاخافتنـە لـە مێـژووی ئەیوبیـدا، سـوڵتان سـەلاحەدین و پادشـاو میرەکانـی تـری ماڵباتـی ئەیوبـی لەپـاڵ هەڵسـوڕاندنی ئەرکـی جیهـادو رزگارکردنـی پانتاییەکـی فراوانـی خاکـی موسـڵمانان لـە جەنگـی خاچپەرسـتەکان و دەرپەڕاندنیـان بـۆ کەنارەکانـی دەریـای ناوەڕاسـت، دەیانویسـت لـە بوارەکانـی تـری خواپەرسـتی و ئاییندارییـدا پشـکداریان هەبێـت و خزمەتـی جڤاکـی ئیسـلامی بکـەن.

کاربەدەستانی ئەیوبـی هـەر لـە سـەرەتاوە بەشـێك لـە بایەخدانیان بۆ پێشخسـتنی شارسـتانی ئیسـلامی تەرخانکـرد و دەرئەنجام کۆمەڵێـك پرۆژەیـان ڕاپەڕانـد لـە کاراکردنـی بزووتنـەوەی زانسـتی و ڕۆشـنبیری و هانـدان ڕێزلێنانـی زانایـان و ئەدیبـان و هاریـکاری خوێنـدکاران و فێرخـوازان و چـلاك کردنـی پرۆسـەی خوێنـدن و کردنـەوەی ژمارەیـەك خوێنـدگاو خانەقاو دەستەبەرکردنی کەلوپەل



قەڵای سەلاحەددین لە قاهیرە

و پێداویستییەکانی قوتابخانەکان و لەم پێناوەدا سەرمایەیەکی زۆریان خەرجکرد.
ئەندامانی ماڵباتی ئەیوبی لە هەر شوێنێك گیرسابنەوە، دەستڕەنگینیان نواندنەوەو خێرخوازی و زانست پەروەری خۆیان سەلماندەوەو جێپەنجەو شوێنەواری چاك و سوود بەخشیان بەجێهێشتووە.
نەجمەدین ئەیوبی باوکی سوڵتان سەلاحەدین لەشارۆچکەی بەعلەبەك خانەقایەکی بۆ سۆفی و پیاوچاکان بنیاتنا و لە قاهیرەش مزگەوتێکی دروست کرد، ئەسەدەدین شێرکۆ مزگەوت و قوتابخانەیەکی لە حەلەب بنیاتنا،(ست الشام)ی خوشکی سوڵتان سەلاحەدین خوێندگایەکی لە دیمەشق دروستکرد، هەروەها سوڵتان سەلاحەدین خۆی و براو کوڕو کوڕەزاکانی بە درێژایی پتر لە نیو سەدە دەیان قوتابخانەو مزگەوت و خانەقاو خانەی فێرکردنی فەرمایشت(دار حديث) و دامەزراوەی خزمەتگوزاری و خێرخوازیان ئاواکرد وەك قوتابخانەکانی (الناصريە)و (العادليە)و (الافضليە)و (الصالحيە)...هتد.
هەروەها میرو فەرماندەو بەرپرسە کوردەکانی دەوڵەتی ئەیوبی بە دەستووری پادشاکانی ئەیوبی لە هەڵمەتی بنیاتنان و ئاوەدانکردنەوەدا کەمترخەمیان نەکردو هەرکاتێ بۆیان لوابێ دڵسۆزانە دەهاتنە دەست و هەڵوێستی جوامێرانەیان دەنواند، میر خۆشترینی هەکاری و میر قوتبەدین هەڵوێستی جوامێرانەیان دەنواند، میر خۆشترینی هەکاری و میر قوتبەدین تەلیلی هەزبانی دوو قوتابخانەیان لە قاهیرە ئاواکرد کە بەقوتابخانەی هەکاری و قوتابخانەی قوتبیە ناوزدەکران، ئەم دوو میرە لە دەستەی یەکەمی میرە کوردەکانی دەوڵەتی ئەیوبی بوون، پێشتریش میر موجاهیدەدین بەزانی کوڕی مامێنی گەلاڵی دوو قوتابخانەی لە دیمەشق دروستکردو بە (المجاهيديە الجوانيە) و (المجاهديە الابدانيە) دەناسران.
بۆ ئەوەی بە دروستی قەبارەی بەشداری کەسایەتییە کوردەکان بزانین لە پرۆسەی ئاواکردن و نۆژەنکردنەوەی دامەزراوە زانستی و رۆشنبیری و فێرخوازییەکان، لە شاری حەلەب لە باکووری وڵاتی شام بەنموونە

دەهێنینەوە لەم شارەدا زیاتر لە بیست مزگەوت و قوتابخانەو گەرماو خانەقا لەلایەن کاربەدەستان و ساماندار و بازرگان و خەڵکانی خێرخوازی کوردەوە بنیاتنراون.
تەنها کوردە تەیمورییەکان ئەم پرۆژانەیان پێشکەش کۆمەڵگای شام کردوە: سێ قوتابخانەو نەخۆشخانەیەك و دوو مەزارگا لە دیمەشق قوتابخانەیەك لە حەلەب یەکێکی تر لە باژێڕی خەلیل (الخليل)و گومبەتێك لە قودس.

## ٢- نەخۆشخانەی تەیموری لە دیمەشق:

ئەم نەخۆشخانەیە لە دامێنی چیای قاسیون لە دیمەشق و لە ساڵی ٦٥٣کۆچی/ ١٢٥٥زایینی لەسەر حسێبی میر سەیفەدین یوسفی کوڕی ئەبو فەوارسی کوڕی موسەکی تەیموریەوە دروستکراوە. خەڵکانی هەژار و نەدار و تەواوی موسڵمانان سوودی لێوەرگرن و بە خۆڕایی و بێ بەرامبەر خۆیان تیایدا چارەسەر بکەن.
میر سەیفەدینی تەیموری هاوڕێ لەگەڵ میران و پیاوانی هۆزی تەیموری بە دەنگ بانگەوازو داواکاری (الملك الصالح)ی ئەیوبیەوە چوون ولە ساڵی ٦٤٢کۆچی /١٢٤٢زایینی لە قەڵای تەیموری هەڵکەوتوو لە نزیك باژێڕی (سەعرەد)ەوە روویانکردە وڵاتی شام و پەیوەندییان بە (الملك الصالح)ەوە کردوو بوونە هاوکارو پشتیوانی.
میر سەیفەدینی تەیموری کەسایەتیەکی سیاسی و کۆمەڵایەتی پایەبەرزو شکۆمەندی کورد بوو، پادشاکانی ئەیوبی خوشیان دەویست و ڕێزیان دەگرت، لەبەرامبەر دڵسۆزی و ئەمەکداری ئەو ومیرانی تری تەیموری، بەردەوام پاداشتیان دەدانەوەو موچە پلەو پایەی بڵندیان پێ دەبەخشین و زەوی و زاری کشتوکاڵی بە پیتیان پێشکەش دەکردن، لە ماوەیەکی کورتدا میرانی تەیموری بوونە خاوەنی دەیان گوندو ڕەزو باخ و بێستان و ئاش و خان و قەیسەری لە دیمەشق و دەوروبەری و میر سەیفەدین

ژمارەیەکیان لەسەر نەخۆشخانەکە وەقف کرد، لەوەقفنامەکەدا بو وردی شیکردۆتەوە کە خەرجی و پێداویستییەکانی نەخۆشخانەکە لە دەرمان و خواردن و کەلوپەل و شتومەك. هەروەها موچەی پزیشك و نوژدارو پەرستارو دەرمانسازو سەرپەرشت و دەرگەوان و پاسەوان و ئاودەرو خزمەتکاری نەخۆشخانەکە و بانگدەرو پێشنوێژی مزگەوتەکەی تەنیشتی چۆن خەرج دەکرێ ، کە هەمووی لە داهات و بەرهەمی گوندو ئاش و خانە وەقفکراوەکان دابین دەکرێن کە ناویان لە وەقفنامەکەدا تۆمارکراوە.

(نەخۆشخانەی تەیموری کە لەلایەن میر سەیفەدینی تەیموری کوردەوە لە ساڵی ٦٥٣کۆچی/ ١٢٥٥زایینی لە دیمەشق دروست کراوە)

- (نەخشەی بناغەی نەخۆشخانەی تەیموری لە دیمەشق)

لەوەقفنامەکە هاتووە کە لە رووی پێشەوەی نەخۆشخانەکە نەخشکراوەو بۆ هەر کارمەندێك لەوانەی باسکران موچەی مانگانەی دیاری کردوەو هەر مووچەیەکیش رێژەیەکی بە دراوی زیوین واتە درهەم و پاشماوەکەش بەدانەوێڵەی گەنم دەدرێت و ئەوەشی چەسپاندووە کە ئەو پارەیەی لە داهاتی شوێنە وەقفکراوەکان دەمێنێتەوە زیندانی و دیلەکانی موسڵمانانی پێ ئازاد بکرێت و بەسەر هەژاران و بێکەسان و لێقەوماواندا ببەشرێتەوە.

ئەم نەخۆشخانەیە تا ئێستاش هەرماوە و نیشانەیەکی زیندووی دەسترەنگینی کوردە تەیمورییەکانەو لەم ماوە درێژە خزمەتێکی بێ سنووری بە دانیشتووانی دیمەشق گەیاندووە.



نەخۆشخانەی تەیموری کە لەلایەن سەیفەدینی قەیموری کوردەوە لە
ساڵی ٦٥٣ کۆچی / ١٢٥٥ زایینی لە دیمەشق دروست کراوە



نەخشەی بناغەی نەخۆشخانەی تەیموری لە دیمەشق

## ٣- مزگەوتی چاکی لە قاهیرە:

جاکـی یـان چاکـی هۆزێکـی بچـووك و نەناسـراوی کـوردە، لـە ناوەڕاسـتی سـەدەی حەفتەمـی کۆچـی/ سـێزدەهەمی زایینـی لـە ئاکامـی هێرشـە خوێنـاوی و وێرانکاریەکانـی مەغۆلـدا بەشـێکی ئـەم هـۆزە دەربـەدەری وڵاتـی شـام و میسـر بـوون و لـە ئاوەرەییـدا ژمارەیـەك کەسـایەتی سـەربازی و کارگێـڕی و ئاینییـان لـێ هەڵکـەوت وەك میـر سـەیفەدین و زانـای ئایینـی محەممـەدی کـوڕی دەربـازەی جاکـی و شـێخ حوسـێنی جاکـی و چەندانـی دی کـە لـە مێـژووی سیاسـی و شارسـتانی میسـردا نەخـش و جێپەنجەیـان دیـارە بـە تایبەتـی لـە نیـوەی دووەمـی سـەدەی حەوتەمـی کۆچـی/ سـێزدەهەمی زایینـی.

کاربەدەسـتان و دەسترۆیشـتووانی جاکی بە دەسـتووری میرانی تەیموری و هەکاری و هەزەبانـی پـەرۆش و ئارەزوومەنـدی دروسـتکردنی دامـەزراوەی خێرخـوازی و خزمەتگـوزاری بـوون و ئـەوەی ئاشـکرایە تەنهـا لەشـاری قاهیـرە مزگەوتێـك و خەڵوەتگایـەك دروسـت کـردوە.

مزگەوتـی جاکـی لـە بنەڕەتـدا کۆنـە مزگەوتێکـی بچـووك و فەرامۆشـکراو بـوو لـە گەڕەکـی (حەکـر) میـر بەدرەدینـی کـوڕی میـر شـەرەفەدینی چاکـی لـە سـاڵی ٧١٣کۆچـی/ ١٣١٣زایینـی دەسـتپیاهێنا و نۆژەنـی کـردووە سـەکۆیەکی بـۆ زیـاد کـردو تـا کرایـە مزگەوتـی سـەرەکی نوێژکـرن و خوتبـە خوێنـدن لـە گەڕەکـی (حەکـر)، نوێـژی هەینـی و جەماعەتـی تیادەکـرا، پێشـنوێژو خوتبـە خوێنیشـی شـێخ حوسـێنی جاکـی بـوو. ئـەم مزگەوتـە تـا سـاڵی ٨٠٦کۆچـی/ ١٤٠٣زایینـی بـە ئاوەدانـی مایـەوەو بـەردەوام نوێـژی لێدەکـراو و خوتبـەی تیـادا دەخوێندرایـەوە، کاتێـك گەڕەکـی (حەکـر) وێرانبـوو و دەوروپشـتی مزگەوتەکـە بوونـە کـەلاوە چۆڵکـران و نوێـژو خوتبـەش لـە مزگەوتـی جاکـی بەتـاڵ کـرا.

هـەر لـە حەکـر و لـە نزیـك مزگەوتـی چاکـی، شـێخ حوسـێنی جاکـی خەڵوەتگایەکـی کردبـووە مـاڵا و بـارەگای خـۆی و خەریکـی خواپەرسـتی و ڕێنیشـاندانی خەڵکـی قاهیـرە بـوو، کـە مردیـش (سـاڵی ٧٣٧کۆچـی/ ١٣٣٦زایینـی) هـەر لـە خەڵوەتگاکـەی شـاردرایەوە. دانیشـتوانی ناوچەکـە تـا سـەدەکانی دوایـی هـەردەم سـەردانی گۆڕەکەیـان دەکـردو بـاوەڕی پتەویـان بـە پیرۆزیـی هەبـوو.

## پــرسيار

- ئەيوبييەكان كێن؟ چۆن دەسەڵاتيان گرتە دەست؟
- بۆچـی، سـوڵتان و میرەكانـی ئەیوبـی بایەخیـان بـە دروسـتكردنی مزگـەوت و قوتابخانـە دەدا؟
- نـاوی ئـەو میـرو سـەركردە كوردانـە بێنـە كـە مزگـەوت و قوتابخانەیـان لـە میسـرو شـام بنیاتنـاوە.
- راپۆرتێـك بنووسـە لەسـەر نەخۆشـخانەی تەیمـوری لـە دیمەشـق یـان لەسـەر مزگەوتـی جاكـی لـە قاهیـرە.

## سەرچاوەكان


- ابو شامة، الروضتين فى اخبار الدولتين.
- ابن واصل، مفرّج الكروب فى أخبار بنى ايوب.
- ابن خلكان، وفيات الاعيان.
- ابن شداد، الاعلاق الخطيره فى ذكر أمراءالشام و الجزيرة جـ ١- ٢.
- اليونينى، ذيل مراۃ الزمان.
- المقريزي، خطط المقريزي.
- النعيمي، الدارس فى تاريخ المدارس.
- أحمد عيسى بك، تاريخ البيمارستانات في الاسلام.
- د. قادر محمد حسن، الكرد في مصر و بلاد الشام م.دراسة حضارية
- د. زرار سديق توفيق، (رۆڵی سیاسی و ئاواكایی كوردە تەیمورییەكان).

## بەندی سێیەم:



# ڕۆڵی زانایانی کورد لە شارستانییەتی ئیسلامیدا

لەو دەمەوەی کە خوێندن و خوێندەواری و کولتووری ئیسلامی لە هەرێمەکانی کوردستان بڵاوبوونەتەوە، فێرخواز و قوتابیانی کورد درێغی و کەمتەرخەمیان نەکردوە لە خۆفێرکردن و خۆپێگەیاندن، لەم پێناوەدا دڵسۆزی و سووربوونی خۆیان سەلماندوە و بەمەبەستی پتر فێربوون و دەستخستنی زانیاری و شارەزابوون لە بوارەکانی زانست و هزردا سنووری کوردستانیان بەزاندووە و خۆیان گەیاندۆتە ناوەندە مەعریفی و ڕوناکبیرییەکان لە موسڵ و بەغداو حەلەب و دیمەشق و قاهیرە و شوێنەکانی دی و لەسەر دەستی گەورە زانایان و بیرمەندانی موسڵمان درێژەیان بە خوێندن دەداو ئاستی زانستی و هزری خۆیان پێش دەخست و لە بوارێکدا بڕوانامەی پسپۆڕیان بە دەست دەهێنا.

لە ڕاستیدا لە کوردستان پاش بەسەرچوونی ڕۆژگاری میرنیشینە خۆماڵییەکان، بزاڤی خوێندن و فێرکردن تووشی نوشستی هات و چالاکی ڕۆشنبیری و زانستی پاشەکشێی کرد مزگەوت و خوێندنگاکان فەرامۆش کران، ئەو گرنگییەی جارانیان نەماو دەسەڵاتدارانی تورکی سەلجوقی بایەخێکی ئەوتۆیان بەتوێژی ڕوناکبیرانی کورد نەدەدا، ئەوەی مابۆوە تینوێتی زانستی فێرخواز و خوێندکارانی نەدەشکاند.

بە درێژایی سەدەکانی ناوەڕاست کۆمەڵێك لە زانایان و هزرڤانان و نووسەرانی کورد دەرکەوتن لە بوارە جیا جیاکانی ئەدەب و زانست و بیر و زمان و شەرع وفیقهدا داهێنانیان هەبووەو ناوبانگیان دەرکردووە،

لـە شـرۆڤكاری قورئـان، مامۆسـتاو قـازی و تۆڕەڤـان و زمانـەوان و شـاعیرو مێژوونـوس و وانەبێـژو شارەزا لـە زانستەکانی فەرمایشـت (محـدث) و پیـاو چـاك و خوتبەخوێـن و پێـش نوێـژ کـە هەندێکیـان لەسـە ئاسـتی جیهانـی ئیسـلامیدا کەسـایەتی ناسـراو و باوەڕپێکـراو بـوون و لەبابەتـە کێشـەدارەکاندا پـرس و ڕایـان پێدەکـرا.

ئـەوەی جێگـەی سـەرنج و پرسـیارە، سـەرجەم ئـەو نـاودارە کوردانـەی کتێـب و نامیلکەیـان دانـاوە و بەزمانـی عەرەبـی نووسـیویانە، دیـارە ئەمـەش هـۆکارو پاسـاوی خـۆی هەیـە پێـش هەمـوو شـتێك زمانـی عەرەبـی زمانـی قورئانـی پیـرۆزو پێغەمبـەر (د.خ)و خەلیفـەو یاوەرەکانـی بـوو، هەروەهـا زمانـی دەسـەڵاتداری و ڕۆشـنبیری و کارگێـڕی بـوو و لـە جیهانـی ئیسـلامیدا بـە پلـە یـەك دەهـات و زۆربـەی دانـەران و نووسـەرانی میللەتانـی موسـڵمان هـەر بـەم زمانـە بەرهەمەکانیـان دەنووسـی، چینـی ڕۆشـنبیرو خوێنـدەواری کوردیـش نەیاندەویسـت لـەم ڕێسـاو دەسـتوورە بـاوە لابـدەن، بەڵکـو خوازیـار بـوون بـەو زمانـە بنووسـن تـا بەرهەمەکانیـان سـوودبەخش بێـت و هەمـووان بتوانـن بیانخوێننـەوە کەڵکـی لێوەربگـرن، لـە لایەکـی تـرەوە زمانـی کوردیـش هێشـتا هـەر زمانـی ئاخافتـن و گفتوگـۆی زارەکـی بـوو، تـا سـەردەمی عوسـمانیش لـە نێـو کـۆڕو مەڵبەنـدە زانسـتی و رۆشـنبیریەکاندا وا بـاو بـوو کـە کـوردی ناشـێت بکرێتـە زمانـی نووسـین و داهێنـان، رەگەزپەرسـتانی میللەتانـی دراوسـێ هـەرگاف پڕوپاگەنـدەی چەواشـەکەریان بڵاودەکـردەوە کـە گوایـا کـوردی زمانێکـی ناتـەواو و دواکەوتـووە ولەبـار نییـە بچێتـە ڕیـزی زمانەکانـی عەرەبـی و فارسـی و تورکیـەوە بـۆکاری نووسـین و خوێندنـەوە دەسـت نـادات و لـەم کارەیـان تـا ڕادەیـەك سـەرکەوتن و توانیـان نەتـەوەی کـورد لـە خشـتە بـەرن و ئـەم بۆچوونـە هەڵـەو ناڕەوایەیـان لـەلا بچەسـپێنن.

ناودارانـی کـورد هەرچەنـدە لـە پرۆسـەی نووسـین و داهێنانـدا زمانـی زگماکیـان پشـتگوێ خسـت و هەرگیـز بیریـان لـە بەکارهێنانـی نەکـردەوە، بـەڵام ناسـنامەی نەتەوایەتـی خۆیـان پاراسـتوەو نازنـاوی نەتەوەیـی یـان نـاوی

ئـەو باژێـڕو هەرێمانـەی لێیـوە هاتـوون هەڵگرتـووەو نـەژادو بنەچـەی خۆیـان لەدەسـت نـەداوەو و شـانازیان دەکـرد بەکـورد بوونـی هـۆزو بنەماڵەکانیـان.
ئەگـەر بڕوانینـە سـەرچاوە و ژێـدەرە مێژووییـەکان لـە ژیاننامـەو دەنگوباسـی سـەدان کەسـایەتی نـاوداری کوردمـان بەرچـاو دەکەوێـت لـە: ئەربیلـی و شـارەزووری و دینـەوەری و ئامـەدی و ئەرمـەوی و هـەکاری و هەزبانـی و جاوانـی گۆرانـی و زەرزاری و مارانـی کـە لەبـوارو لایەنـە هەمەجۆرەکانـی زانسـت و وێـژەو بیرمەنـدی و کولتـووری ئیسـلامیدا هەڵکەوتـوون و گەیشـتوونەتە ئاسـتێکی بـەرزو پایەکـی بڵنـدو بەکارەکانیـان شارسـتانییەتی کوردیـان دەوڵەمەندکـردوە و دڵسـۆزانە و لێبڕاوانـە خزمەتـی شارسـتانییەتی ئیسـلامیان کـردوە.

## ١- فەقێ حەنەفی ئەبو عەبدوڵای گۆرانی (٥٤٣ کۆچی/ ١١٤٨ زایینی):

ئەبـو عەبـدوڵای گۆرانـی نـاوی حوسـێنەو کـوڕی ئیبراهیمـی کـوڕی حوسـێنی کـوڕی جەعفـەرە لـە هـۆزی مـەزن و دێرینـی گۆرانـە کـە لـە سـەرچاوە عەرەبیەکانـدا کـراوە بـە (الجورقـان) ئـەم هـۆزە لـە بەرزاییەکانـی حلـوان و شـارەزورو شـارە دێرینەکانـی دەرتەنـگ و سـەرپولی زەهـاو نیشـتەجێ بـوون.
ئەبوعەبـدوڵای گۆرانـی لەسـەر دەسـتی زانایـان و مامۆسـتایانی عێـراق و کوردسـتان ئایینـزا (مەزهـەب)ی حەنەفـی و زانسـتەکانی قورئانـی پیـرۆزو فەرموودەکانـی خوێنـدەوە و شـارەزایی دەستخسـتوە و بۆتـە پسـپۆڕێکی زیـرەك و کارامـەی ناوچەکـە لـە زانسـتەکانی فەرمـوودە (حەدیـث) و پـرس و راوێـژی پێکـراوە لەناسـینەوەی فەرموودە راستەکان و جیاکردنەوەی لـە فەرموودە لاوازو هەڵبەسـتکراوەکان، لـەم بارەیـەوە پەرتووکێکـی داناوە بەناونیشـانی (الموضوعات فـی الاحادیـث المرفوعـات) کـە لەنێـو شـارەزایاندا بـە پەرتووکـی (الاباطیـل) نـاو دەبـرا و تیایـدا فەرمـوودە هەڵبەسـتراو گومانلێکراوەکانی دەستنیشـان کردوە، بەبەڵگـەوە سـەلماندویەتی کـە ناوەڕۆکیـان هەڵـەو نادروستە، چەنـد دانەیـەك لـە دەستنووسـی ئـەم پەرتووکـە لـە پەرتووکخانەکانـی جیهـان پارێـزراون. ئـەم پەرتووکـە بـووە بابەتـی گفتوگـۆ و لێدوانـی زانایانـی فەرمـوودەو هەندێکیـان

پشـتگیری سـەرنج و ڕەخنەکانـی ئەبوعەبدوڵایـان کـردوە، پێیـان وایـە کـە لـە کارەکەیـان سـەرکەوتوو بـوون و بەباشـی ڕاسـتییەکانی پێـکاوە. ئەبوعەبـدوڵای گۆڕانـی پەرتووکێکـی تـری دانـاوە بەناونیشـانی (التکلیـف فـي الفـروع) ولـە سـاڵی ٥٤٣کۆچـی/ ١١٤٨زایینـی کۆچـی دوایـی کـردووە.

## ٢- شێخ ئەحمەدی زەرزاری (٥٩١کۆچی/ ١١٩٥زایینی):

ئەبوعەبـاس ئەحمـەدی کـوڕی عوسـمانی کـوڕی ئەبـو عەلـی کـوڕی مەدیـی زەرزاری، زانـاو پیـاو چاك و قورئـان خوێنێکـی پایـە بڵنـد و بەتوانـای شـاری هەولێـرە، بەمەزنـدە لـە سـەرەتای سـەدەی شەشـەمی کۆچـی/ دوانزدەهەمـی زایینـی لەیەکێـك لـە گوندەکانـی هـۆزی زەرزاری هاتۆتـە دونیـاوە، زەرزاریـش (زەرزا یـان زراری) هۆزێکـی مـەزن و بەدەسـەڵاتی ناوچـەی هەولێـرە.

ئـەوەی شـایانی باسـە شـاری هەولێـر لەسـەردەمی ئەتاباکـی (٥٢٢-٦٣٠کۆچی/ ١١٢٨-١٢٣٣زایینـی) هەڵسـانەوەیەکی شارسـتانی گـەورەی بەخـۆوە دیـت، لـە شـارۆچکەیەکی خامـۆش و فەرامۆشـکراوە بەرەبـەرە بـووە ناوەندێکـی ڕۆشـنبیری و بازرگانـی ئـاوەدان. دەیـان مزگـەوت و قوتابخانـەو خانەقاو خانەی خوێندنـی فەرمایشـت و خـان و بـازاڕو قەیسـەری شـارەکەیان ڕازاندبـۆوە ڕوویەکـی جـوان و زیندویـان پێبەخشـیبوو و لـە ئاکامـدا چەندیـن کەسـایەتی زانسـتی و ڕۆشـنبیری لـە خەڵکـی شـارەکەو دەوروبـەری پێگەیشـتن و خزمەتـی شارسـتانییەتی ئیسـلامیان کـردو یەکێـك لەوانـە شـێخ ئەحمـەدی زەرزاریـە.

(ابـن المسـتوفي) دانـەری پەرتووکـی (تاریـخ ربـل- کـە تایبەتـە بـە مێـژووی شـاری هەولێـر) کـە شـێخ ئەحمـەدی بینیـوە وەك خـۆی دەیگێڕێتـەوە هـەردەم دەچـووە خزمەتـی و ئامـادەی گوتـار خوێندنـەوەو وانەکانـی دەبـوو، گەلێـك ستایشـی کـردوەو پیاهەڵدانـی پێـدا گوتـوە و بـاس دەکات کـە تـا بڵێـی خونـاس و بەبـڕوادارو ئاینـدار بـووەو بەڕادەیـەك شـکۆمەندو بەڕێـز بـوو کـە میـران و کاربەدەسـتان لـە پێـش ماڵەکەیـدا ڕیزیـان دەبەسـت تـا بچنـە خزمەتـی.

شـێخ ئەحمـەدی زەرزاری بەنیـازی زانسـتخوازی و خۆپێگەیانـدن سـاڵانێکی درێـژە هەولێـری بەجێهێشـتووە و لـە کوردسـتان دوورکەوتۆتـەوەو گەشـتێکی

زانستی درێژەخایەنی کردوەو خۆی گەیاندۆتە خزمەت گەورە مامۆستایان و شارەزایان و لە شارەکانی موسلا و بەغداو ئەسفەهان و هیرات و زانستەکانی قورئانی و حەدیسی خوێندوە، لە شاری هیرانی هەرێمی خۆراسان گوێی لە بیستنی پەرتووکی((صحیح البخاری)) گرتووە. شێخ ئەحمەد دوای گەڕانەوەی بۆ هەولێر ژیانی گۆشەگیری و خەڵوەتنشین هەڵبژاردو بۆ ساتێ لە ماڵەکەی دوورناکەوتەوە، تامردنی لە مانگی رەمەزانی ساڵی ٥٩١کۆچی/ ١١٩٥زایینی هەر خەریکی نوێژکردن و قورئان خوێندن و نزاو پاڕانەوە بوو.

شێخ ئەحمەدی زەرزاری دوو پەرتووکی دەربارەی زانستی خوێندنەوەی قورئان (علم القرأن) داناوەو (المؤنس) و (المنتخب)، کە وادیارە هەردووکیان فەوتابوون.

## ٣- هۆزی گاوانیی کورد خزمەتکردنی کولتووری ئیسلامی:

گاوان (گاوانی – الجاوانیە) هۆزێکی گەورەو فرەخێڵی کوردە، لە سەردەمی عەباسی لە باشووری کوردستان لە ناوچەکانی مەندەلی و واست (کوت) و حیلە باشووری بەغدا و کەناری رۆژئاوای ڕووباری دیجلە ئاکەنجی (نیشتەجێ) بوو بوون، لەدوا ساڵەکانی سەدەی چوارەمی کۆچی / دەهەمی زایینی، میران و سەردارانی گاوان میرنشینێکیان دامەزراند کە پتر لە سەدەو نیوێك فەرمانڕەوایی ڕووبەرێکی بەرینی ناوەڕاست و ڕۆژهەلاتی بەرینی ناوەڕاست و ڕۆژهەلاتی عێراقیان دەکرد، هەروەها پیاوانی ئەم هۆزە نەخشی دیار و کاریگەریان لە ڕووداوەکانی عێراق هەبوو لە سەدەی شەشەمی کۆچی/ دوازدەهەمی زایینی.

لە جیهانی ئەدەب و زانست و ڕووناکبیریشدا هۆزی گاوان بەشداری کەم نییە و جێپەنجەی پیاوانی دیاردە و شایانی ئاماژەیە و بگرە لەڕیزی پێشەوەی هۆزەکانی کوردستانەوە دێت و گەلێك زانا و فەقیە و شاعیر و نووسەر لە خێڵ و تیرەکانی ئەم هۆزە هەڵکەوتوون، لەوانە:

### أ- ئەبوسەعیدی گاوانی (٤٦٨–٥٦١ کۆچی / ١٠٧٦–١١٦٦ زایینی):

محەممەدی کوڕی عەلی کوڕی عەبدوڵای گاوانی لەساڵی ٤٦١ کۆچی/ ١٠٧٦ زایینی لەدایك بووە، لە خوێندنگا و مزگەوتەکانی بەغدا لەسەر دەستی کەڵە زانایانی ئیسلام وەکو ئیمامی غەزالی و عیمادەدینی تەبری ناسراو بە (الکیاهراسی) و ئەبوبەکری شاشی بە زانست گۆشکراوە و پێگەینراوە و سەرکەوتنی بەدەست هێناوە، ئەبو سەعیدی گاوانی شارەزاییەکی قووڵی لەفیقە و فەرموودەکان هەبوو، لەهەمان کاتدا لەبواری هۆزان (شعر) و ویژەیی عەرەبیشدا شوێن پەنجەی دیارە و دەستی هۆزان دانانیشی هەبووە، هەرچەندە تا ئێستا ڕوون نەبۆتەوە کە دیوانی هەبووە یان نا، سەرچاوەکان چەند دێڕێکیان لە هۆزانەکانی تۆمارکردووە، خۆیشی پەرتووکێکی لەبارەی هونەری شیعرەوە نووسیوە، هەروەها شرۆڤەی پەرتووکی (مقاومات الحریری) کە نووسەرەکەی (الحریری) یە کردوە .

### ب- شێخ وەرامی گاوانی (٦٠٥ کۆچی – ١٢٠٨ زایینی ):

شێخ وەرام کوڕی میر ئەبو فیراس عیساوی کوڕی میر ئەبونەجمی گاوانییە، دیارترین و بەناوبانگترین کەسایەتی ئایینی هۆزی گاوانە، نزیکەی ساڵی ٥٣٠ کۆچی / ١١٣٥ زایینی لەدایك بووە، هەرچەند لە ماڵباتی میرانی دەسەڵاتدار و خانەدانی گاوانییە، کەچی ئەم دەستی لە کاروباری میرایەتی و لەشکری کێشایەوە و ژیانی تەرخان کرد بۆ خواپەرستی و گۆشەگیری، کاتی خۆی بە قورئان خوێندن و ئاییندداری و ڕێنیشاندان و پاڕانەوە دەگوزەراند، تا وای لێهات خەڵکی لەبەر پیرۆزی و بۆ ڕاوێژ سەردانیان دەکرد و ئامادەی وانە و گوتارەکانی دەبوون و بەند و ئامۆژگاریان لە بۆ چوون و ئاخافتەکانی وەردەگرت .

شێخ وەرام پەرتووکی (( تنبیە الخواطر ونزهة النواظر)) ی داناوە کە بە (کۆکراوەی شێخ وەرام) ناوی ڕۆیشتووە و بریتییە لە کۆمەڵێك گوتار سەبارەت بە خواناسی و وەعز و ئامۆژگاری خەڵکی بۆ کاری چاکە و

پەیڕەویکردنی کردەوەی پێغەمبەر (د.خ) و یاوەرانی .
شێخ وەرام لە ساڵی ٦٠٥ کۆچی / ١٢٠٨ زایینی کۆچی دوایی کرد و لە مەزاری ئیمام عەلی کوڕی ئەبوتالیب لە نەجەف بەخاك سپێردرا.

**ج- شێخ موتەلیبی بەشیری گاوانی (٥٤٧- ٦٢٤کۆچی/ ١١٥٢- ١٢٢٧ زایینی):**

شێخ موتەلیبی کوڕی بەدری کوڕی موتەلیبی کوڕی زوهمانی بەشیریە، لە خێڵی بەشیریە کە یەکێکە لە خێڵەکانی هۆزی گاوان، لەساڵی ٥٤٧ کۆچی / ١١٥٢ زایینی هاتۆتە دنیاوە، زۆربەی ژیانی لە بەغدای پایتەختی خەلافەتی عەباسی بەسەربردووە و جێ ئاماژە بوو لە زانستەکانی فەرمایشت و شەریعەدا، لە خوێندنگاکانی بەغدادا بە مامۆستا دامەزراوە و بە وانەگوتنەوە خەریکبووە، مێژوونووس (المنذری) یەکێکە لەوانەی لەلایەن شێخ موتەلیبەوە بڕوانامەی زانستی پێبەخشراوە، شێخ موتەلیب لە ساڵی ٦٤٢ کۆچی/ ١٢٢٧ زایینی کۆچی دوایی کردوە و لە بەغداد نێژراوە .

**د- فەقێ شافیعی (ابن الصلاح) ی شارەزووری(٥٧٧–٦٤٣کۆچی/ ١١٨١ – ١٢٤٥زایینی):**

تەقیەدین عوسمانی کوڕی سەلاحەدینی کوڕی عەبدولڕەحمانی کوڕی عوسمانی کوڕی موسای کوڕی ئەبو نەسری شارەزووری (ابن الصلاح) لەساڵی ٥٧٧ کۆچی /١١٨١ زایینی لە گوندی شارخانی ولاتی شارەزوور لە بنەماڵەیەکی خانەدان زانستپەروەر لەدایك بووە، سەلاحی باوکی (٥٣٧-٦١٨ کۆچی / ١١٤٢-١٢٢١زایینی) مامۆستایەکی ئایینی پایە بەرزی ناوچەکە بوو، بۆیە عوسمانی کوڕی بەناوی ئەوەوە ناوی دەرکردوە بەکوڕی سەلاح (ابن الصلاح) ناسراوە.
(ابن الصلاح) قۆناغە سەرەتاییەکانی خوێندنی لە مزگەوت و حوجرەکانی شارەزوور بڕیوە و لای باوکی فیقهی شافیعی فێربووە، بۆ درێژەدان بە خوێندن باوکی ڕەوانەی شاری موسڵی کردووە و لەوێ گوێبیستی

وانەکانی زانای مەزن عیمادەدین کوڕی یونس (ابن یونس) بووە، دواتر روویکردۆتە هەرێمی خۆراسان و ماوەیەکی درێژ لە زانستی حەدیپی کۆڵیوەتەوە، پاشان کۆچی کردوە بۆ وڵاتی شام، لە شارەکانی قودس و دیمەشق و لە قوتابخانەکانی دیمەشق کە لەلایەن سوڵتان سەلاحەدینی ئەیوبی و ئەندامانی تری ماڵباتی ئەیوبییەوە و دەیان قوتابی و فێرخوازی هەبوون و میرانی ئەیوبی ڕێزیان دەگرت و پاداشتیان دەدایەوە .

(ابن الصلاح) لەپاڵ مامۆستاییدا، شارەزایەکی وردبین و هەڵکەوتوو بوو لە شرۆڤەکردنی قورئانی پیرۆز فەرموودەکانی پێغەمبەر (د.خ) وفیقهی شافعیدا هاوکات موفتیەکی بە ئەزموون و سەرکەوتوو بوو، فەتواکانی لەلایەن هەڤاڵ و خوێندکارەکانیانەوە لە بەرگێکدا کۆکرانەوە، سەرەڕای فەتواکانی ئەم پەرتوکانەشی داناوە :

١- **طبقات الشافعیه.**

٢- **أدب المغتبى.**

٣- **کتاب حول مناسك الحج .**

٤- **علوم الحدیث.**

(ابن الصلاحی) هەر خەریکی وانە گوتنەوەو فەتوادان بوو تا لە مانگی (ربیع الاخر) ی ساڵی ١٢٤٥/٦٤٣ زایینی کۆچی دوایی کردو لە گۆڕستانی سۆفیەکان لەشاری دیمەشق بە خاك سپێردرا.

**٥- ابن الحاجب (٥٧٠ – ٦٤٦ کۆچی / ١١٧٤ – ١٢٤٨ زایینی):**

فەقێی مالیکی زمانەوانی بەتوانای کورد عوسمانی کوڕی عومەری کوڕی ئەبوبەکری کوڕی یونسی دوینی ڕەوادی لە دوا ڕۆژەکانی ساڵی ٥٧٠ کۆچی / ١١٧٤ زایینی لە باژێڕی ئەسنای سەر بە پارێزگای قوس لە سەعیدی میسر هاتۆتە دونیاوە، باوکی پەردەدار (حاجب) ی میر عیزەدین موسەکی کوڕی چەکۆی کورد بوو، فەقێ عوسمان نازناوی کوڕی پەردەدار (ابن الحاجب) ی پێوەلکا، میر عیزەدین موسەکیش لە خاڵۆزای سوڵتان سەلاحەدینی ئەیوبی بوو یەکێك بووە لە سەرکردەکانی سوپاکە.

خێزانی ابن (الحاجب) لە خێڵی ڕەوادی (ڕەوەندی) سەر بەهۆزی مەزنی هەزبانین و لە بنەڕەتدا خەڵکی دەڤەری دوینی هەرێمی ئەرمینیان کە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا هەوارگەی خێڵ و تیرەکانی هۆزی هەزبانی بوو، هاوڕێ لەگەڵ ئەیوبیەکان پەڕیوەی وڵاتی شام و میسربوون بە یەکجاری لە تاراوگەی گیرسانەوە.

(ابن الحاجب) هەر بە منداڵی نێردراوەتە بەر خوێندن و لە خوێندنگاکانی قاهیرە قورئان و فیقهی مالکی فێربووە، دواتر بەزمانی عەرەبیەوە خەریک بووە، دەستێکی باڵای هەبوو لە وردەکارییەکانی و وشەسازی و رستەسازی زمانی عەرەبی و خاوەنی دید و تێڕوانینی ڕێزمانی تایبەتی خۆی هەبوو کە هەندێکیان تا ئەمڕۆش بەهاو گرنگیان هەر ماوە، نووسینەکانی لەوپەڕی تێر و تەسەلی و ڕەوانی بوو، لە شارەکانی قاهیرە و دیمەشق و ئەسکەندەریە، خەڵکانێکی زۆر ئامادەی وانەکانی دەبوون و سوودیان لە بۆچوون و سەرنجە وردەکانی وەردەگرت و تا مانگی شەواڵی ساڵی ٦٤٦ کۆچی / ١٢٤٨ زایینی لەشاری ئەسکەندەرییە چووە بەر دلۆڤانی خودا و ئەم بەرهەمانەی لەپاش بەجێماوە کە گرنگترینیان :

**١- المنتهى فى اصول الفقة.**

**٢- الشافية فى الصرف (دەربارەی وشەسازی لە زمانی عەرەبیدا).**

**٣- الكافية فى النحو (دەربارەی ڕستەسازی لە زمانی عەرەبیدا).**

## کورد و نووسینەوەی مێژوو:

بەشــداری مێژوونووســانی کــورد و ئەوانــەی نیشــتەجێی کوردســتانن کــە بەتــەواوی یەکلانەبوونەتــەوە کــە ڕەگەزیــان کــوردن یــان نــا، لــە نووســینەوەی مێــژوودا، شــایانی لێــدوان و لەســەر ڕاوەســتانە لەبەرئــەوەی بەبەرهەمەکانیــان لاپــەڕە شــاراوەو نەزانراوەکانــی مێژوویــان ڕوونکردۆتــەوە و لــە فەوتــان و لەبیرچوونەوەیــان ڕزگارکــردووە، جــا چ مێــژووی گشــتی ســەر زەمینــی ئیســلام بێــت یــان مێــژووی شــارێك یــان هەرێمێکــی کوردنیشــین . لــەو مێژوونووســە کوردســتانانەی دەربــارەی مێــژووی گشــتی پەرتوکیــان دانــاوە وەك:

١- دەینــوەری لەدایکبــووی شــاری دەینــوەر لــە هەرێمــی چیاکانــی (کوردســتانی ڕۆژهــەڵات) خاوەنــی کتێبــی (الاخبــار الطــوال).
٢- ابــن الاثیــر، لەدایکبــووی جزیــرەی بۆتــان چەند پەرتووکێکــی مێژوویی دانــاوە لەوانــە (الکامــل فــی التاریــخ ) و (التاریــخ الباهــر) و (البــاب فــی تهذیــب الانســاب).
٣- ابــن شاهانشــا، نــەوەی میــر شاهنشــای بــرای ســوڵتان ســەلاحەدینی ئەیوبــی دانــەری پەرتووکــی (مضمــار الحقائــق).
٤- ابــن خلــکان لــە هــۆزی زەرزاری و خــاوەن کتێبــی (وفیــات الاعیــان و أنبــاء الزمــان).
٥- عیزەدیــن محەمــەد نــەوەی میــر خوشــترین (هکایــی) لــە ســەرکردەکانی ســوڵتان ســەلاحەدین. نووســەری کتێبــی (تاریــخ ابــن ابــی الهیجــاء)
٦- میــر ئیســماعیلی کــوڕی عەلــی ناســراو بــە (ابــو الفــداء ) لــە بنەماڵــەی ئەیوبــی خاوەنــی هــەردوو پەرتووکــی (المختصــر فــی اخبــار البشــر) و (تقویــم البلــدان) .

لەنێو دانەران و مێژوونووسانی کوردستان، نیشتمانپەروەرانی وا هەبوون کە لەپاڵ بایەخدان خۆخەریککردنیان بە خزمەتکردنی ئایینی ئیسلام و دانانی پەرتووك سەبارەت بە زانستە ئایینیەکان، هۆگری و خۆشەویستی نیشتمان هەستی دەبزواندن وای لێکردن کە بەشێك لە کاتیان تەرخان بکەن بۆ نووسینەوەی مێژووی ئەو شارە و هەرێمانەی کە تێیدا لەدایك بوون و پەروەردەکرابوون.

ئەوەی تا ئێستا ڕوونبۆتەوە و مێژوونوسان ئاماژەیان پێداوە چەند سەرچاوەیەکی مێژووی هەن تایبەتن بەمێژووی شار و هەرێمەکانی کوردستان لەوانە (تاریخ اذربیجان) کە لەلایەن (ابن ابی الهیجاء الروادی) ناوێکەوە نووسراوە و لەوە دەچێت لە میرەکانی ڕەوادی بێت، و (تاریخ اربل) لە (تاریخ حصن کیفا) و (تاریخ الاخلات) و (تاریخ الفارقی) و (تاریخ اربل) لە نووسینی (ابن المستوفی) و چەند مێژوویەکی تر، بێجگە لە مێژووی فارقی و تەنها بەرگی دووەمی (تاریخ اربل) و ئەوانی دی هەموو لەناوچوونە و بەدەستمان نەگەیشتوون و هیچیان لەبارەوە نازانرێت.

## - ئیبن خەلەکان (ابن الخلکان) (٦٠٨ – ٦٨١کۆچی / ١٢١١-١٢٨٢ زایینی)

ئیبن خەلەکان ناوی ئەحمەدی کوڕی محەمەدی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی ئەبوبەکری کوڕی خەلەکان، بنەماڵەکەیان بەناوی خەلەکانی باپیرە گەورەیانەوە ناوبانگی دەرکردوە. لەساڵی ٦٠٨ کۆچی/١٢١١زایینی لە خێزانێکی ئایینی و خانەدانی کوردی زەرزاری و لە قەڵای هەولێر لەدایك بووە، قۆناغە بەراییەکانی خوێندنی لە حوجرە و قوتابخانەکانی هەولێر تەواوکردووە و لەشاری موسڵیش لای زانا کەمالەدینی کوڕی یونس (ابن یونس) درێژەی بەخوێندن داوەو لەتافی لاویتیدا لە هەولێر دەرچووە و بە نەریتی فێرخوازانی کورد ڕوویکردۆتە وڵاتی شام کە ئەوکاتە بەشێك بوو لە قەڵەمڕەوی ئەیوبی و ماوەیەك لەشاری حەلەب ماوەتەوە و لای قازی

بەهائەدیـن کـوڕی شـەداد (ابـن شـداد) خوێندویەتـی، پاشـان ڕوویکردۆتـە دیمەشـق و لەوێشـدا چووەتـە قاهیـرە لـە دام و دەزگا قەزاییەکانـی دەوڵەتـی ئەیوبـی خزمەتـی کـردووە .

ئیبـن خەلـەکان مەزنتریـن و ناودارتریـن مێژوونـوس و کەسـایەتی زانسـتی و قەزایـی کـوردە، بەڕادەیەکـی بـەرز مرۆڤێکـی بەهرەمەنـد و لێهاتـوو و زیـرەك بـوو و شـارەزاییەکی کارامـە بـوو لـە شـەریعەت و دادوەری ئیسـلامیدا، جێگەی ستایش و متمانـەی پاداشـتەکانی ئەیوبـی و مەملوکـی بـوو، سـەردەمانێك قـازی گشـتی – قـازی قازیـەکان (قاضـي القضـاة) بـوو لـە دیمەشـق و وڵاتـی شـام کـە بڵنتریـن پایـەی دادوەریـە و وەك قازییەکـی ڕاسـترەو دادپـەروەری نـاوی دەرکـرد، هەروەهـا لـە قوتابخانەکانـی دیمەشـق بـۆ مـاوەی دە سـاڵان وانـەی دەگوتـەوە و لـە سـاڵی ٦٨١ کۆچـی / ١٢٨٢ زایینـی کۆچـی دوایـی کـرد.

ئیبـن خەلـەکان هەرچەنـدە سـەرقاڵی ئیش و کاری قازیەتی و مامۆسـتایەتی بوو، ئـارەزووی مێژوونوسینیشـی هەبـوو، وەك خـۆی دەڵێـت خولیـای دەسـتخسـتن و دەورکردنـەوەی پەرتووکـە مێژووییـەکان بـوو تـا گەلێك زانیـاری و دەنـگ و باسـی پیاوانـی مێـژووی لاکەڵەکەبـوو و لـە سـاڵی ٦٥٤ کۆچـی / ١٢٥٦ زایینـی پەرتووکـی (وفیـات الاعیـان و أنبـاء ابنـاء الزمـان) ی نووسـی کـە بـە گەواهـی ڤەکۆڵـەران سـەرچاوەیەکی ڕەسـەن و دانسـقەیە و زمانێکـی ڕەوان و پـاراو و شـێوازێکی جـوان و پوختـە نوسـراوە، مێژوونـووس گەلێك وردەکاری کـردوە و ڕێبـازی بـێ گـرێ و گۆڵـە بەکارهێنـاوە مەبەسـتی داوە بـە دەسـتەوە و ئـەو هەواڵـەی گومانـی لـێ کردبێـت پشـتگوێی خسـتوە .

ئـەم پەرتوکـە کـە لـە هەشـت بەرگـی قەبـارە گـەورەدا بڵاوکراوەتـەوە، ژیاننامە و بەسـەرهاتی پتـر لـە هەشـت سـەد کەسـایەتی موسـڵمان لەخـۆ دەگرێـت کـە هەندێکیـان کـوردن پاشـا و میـر و سـەرکردە و زانـا و شـاعیر و قـازی و وەزیـر و تۆڕەڤـان و مێژوونـوس و زانیاریەکـی زۆر و باوەڕپێکـراو پێشـچاو دەخـات و ئیبـن خەلـەکان بـەم پەرتووکـە نایابـەی کەلێنێـك لـە پەرتوکخانـەی مێژوویـی پڕکردۆتـەوە .

## - کورد و ڕێچکەی سۆفیگەری :

سـۆفیگەری – تەسـەوف وەك بیرمەنـدی موسـڵمانان (ابـن خلـدون) ( ٧٣٢ – ٨٠٨ کۆچـی / ١٣٣٢ – ١٤٠٥ زایینـی ) دەڵێـت بریتییـە لـە وازهێنـان لـە خۆشی رووکەشـی ژیـان و خۆتەرخـان کـردن بـۆ پەرستنی خـوای گـەورە و دەسـت بـەردان لـە جوانـی و ڕازاوەیـی دنیـا و خۆبەدوورگرتـن لـەو شـتانەی مـرۆڤ ئارەزوویـان دەکات لـە ڕابـواردن و سـامان و پلـە و پایـە و پەیوەسـت بـوون لـە خەڵوەتـگا بەنیـازی خواپەرسـتن، ئەمـەش لای هەڤاڵانـی پێغەمبـەر (د.خ) و باوباپیـران و پێشـینان نەریتێکـی گشـتگیر و باوبـووە، کەچـی دوای ئـەوەی دنیاخـوازی لای مـرۆڤ هاتەکایـەوە، سـۆفیگەری تەنها ئـەو کەسانەی دەگرێتـەوە کـە نەریتـی خواپەرسـتیان پاراسـت .

پیاوچاکانـی کـورد ڕۆڵـی بنەڕەتـی و بەرچاویـان هەیـە لـە گەشـەکردن و درێژەپێدانـی ڕێبـازی سـۆفیگەری و بڵاوکردنـەوەی بیروباوەڕی خواپەرستی و گۆشـەگیری لەنێـو چیـن و توێژەکانـی کۆمەڵـگادا و تێگەیانـدن و ئاشـناکردنی کۆمەڵانـی خەڵـك بـە چەمـك و مەبەسـتی ڕێچکـەی سـۆفیگەری. لەڕاسـتیدا زۆربـەی ڕێبـەر و ڕێنیشـاندەرانی سـۆفیگەری لـە سـەدەکانی پێنجەم و شەشـەمی کۆچـی / یازدەهـەم و دوازدەهەمـی / زایینـی لە ئەولیـا و پیاوچاکانی کوردبوون لەوانـە:

**١- شـێخ محەمـەدی شـەنبەکی (سـەدەی پێنجەمـی کۆچـی / یازدەهەمـی زایینی)**

**٢- شـێخ ئەبوبەکـری هـەواری (هەمـان سـەدە) لـە هـۆزی هـەواری دانیشـتووی ناوچـەی (البطائـح) لـە خـوارووی عێـراق.**

**٣- شێخ ئەبو وەفای حلوانی ناسراو بە (تاج العارفين)**

لەتیـرەی نەرجسـی کـە تیرەیەکـی تـرە لـە هـۆزی گاوان، کـە یەکێکـە لـە مەزنتریـن و ناودارتریـن پێشـڕەوی سـۆفیگەری لـە کوردسـتاندا، شـێخ عبدالقـادری گەیلانـی شـاگردی ئـەم بـووە و لەبەردەستیدا فێـری خواپەرستی بـووە و کەشـف و کەراماتـی گێڕاوەتـەوە.

### ٤- شێخ جاگیری زاهید (م ٥٩٠ کۆچی/ ١١٩٤ زایینی)

شـێخ جاگیـر، نـاوی دروسـتی محەمـەدی کـوڕی دەشـەمی نێرگزیـە لـە خێزانێکـی کـوردی هـۆزی گاوانییـە، جێگـر و درێـژە پێـدەری گـەورە ڕێبەرانـی سـۆفیگەریە لـە عێراقدا،سـەرچاوەیەکانی تەسـەوف لەسـەری دواون و باسـی کەشـف و کەرامـات و ژیانـی خەڵوەتنشـینیان کـردوە، لە بیابانێکـی چۆڵەوانیـدا لـە گۆشـەیەکی دووره دەسـت پەناگیـر ژیانـی بەسـەردەبردو دابـڕاو لـە ئاوەدانـی خەریکـی خواپەرستی بـوو تـا لـە ساڵی ٥٩٠ کۆچی/ ١١٩٤ مـرد، پاشـان دانیشـتوانی سـامەڕا و دەوروبـەری لـە تەنیشـت گۆشـە و گۆڕەکـەی گوندێکیـان ئـاوەدان کـردەوە و تـا ڕۆژگاری ئەمـڕۆش هەرمـاوە و بـە (رازان) دەناسـرێت و دەکەوێتـە ڕۆژهەڵاتـی ڕووبـاری دیجلـە و لـە دووری ٢٤کـم لەشـاری سـامەرا.

دوای مردنـی شـێخ جاگیـر بـراو برازاکانـی درێژەیـان بـە ڕێبازەکـەی داو تـا سـەرەتای سـەدەی هەشـتەمی کۆچـی / چواردەمـی زایینـی بـەردەوام بـوون.

## پرسیار

١- بۆچی زانایان و بیرمەندانی کورد بەرهەمەکانیان بەزمانی زگماکیان کوردی نەدەنوسی؟

٢- فێرخوازانی کورد بۆچی نیشتمانیان بەجێدەهێشت و بەرە و شارە گەورەکانی جیهانی ئیسلامی کۆچیان دەکرد؟

٣- ڕێبازی سۆفیگەری پێناسە بکە و ناوی گەورە سۆفیاتی کورد بنووسە.

٤- ئەو مێژوونووسانە کێن کە دەربارەی مێژووی کورد و کوردستان پەرتوکیان داناوە؟

٥- کورتە ڕاپۆرتێك ئامادە بکە کە سەبارەت یەکێك لەم کەسایەتیانە (ابن الحاجب)، شێخ ئەحمەدی زەراری، ئەبو عەبدولاّی گۆران).

# سەرچاوەکان


١. التادفی، قلائد الجواهر فی مناقب الشيخ عبدالقادر

٢. ابن خلكان، وفيات الاعيان

٣. الذهبی، سير اعلام النبلاء.

٤. الشطنوفي، بهجة الاسرار و معدن الانوان

٥. العماد الاصفهانی، خريدة القصير مجريدة العصر

٦. ابن كثير، البداية والنهاية

٧. ابن المستوفي، تاريخ أربل

٨. المنذري، التكلمة لسوفيات النقلة

٩. اليونيني، ذيل مرأة الزمان

١٠. محمد أمين زكی، مشاهير الكورد و والكوردستان

١١. مصطفی جواد، جاوان القبيلة الكوردية المنسية

١٢. د. قادر محمد حسن، إسهامات الكرد في الحضارة الاسلامية (دهوك: ٢٠٠٩)

# بەشی هەشتەم

## شارستانییەتی ئەورووپا
## لە سەدەکانی ناوەڕاستدا

# بەشی هەشــتەم



## یەکەم:
## شارستانییەتی ئەورووپا لە سەدەکانی ناوەڕاستدا

سـەدەکانی ناوەڕاسـت لـە مێـژووی ئەورووپـادا بـەو سـەردەمە دەگوترێـت کـە دەکەوێتـە نێـوان کۆتایـی هاتنـی سـەردەمی کۆنـەکان کـە هـاوکات لەگـەڵ روخاندنـی ئیمپراتۆریەتـی ڕۆمانـی لـە ڕۆژئـاوا لـە ساڵی ٤٧٦ زایینـی و هەتـا سـەرەتای سـەردەمی بوژانـەوە (ڕێنیسـانس) لـە سـەدەی چواردەیەمـی زایینـی . واتـا سـەدەکانی ناوێـن نزیکـەی هەشـت سـەدەی لـە دیرۆکـی ئەوروپـادا خایانـدوە شارسـتانی گەلانـی ئەورووپـا ئـەو وەختـە ئەوەنـدە گیـرۆدەی بەسـەرچووك و بۆشـایی و میراتـی فکـری سـەردەمی کۆنـەکان و ئالـوودە و وابەسـتەی دەسـەڵاتی رۆحـی ئایینـی و کەنیسـە بـوو بەڕادەیـەك هەڵکشـانی بەشـێنەیی و گەشـەکردنی سـنووردار بوو. بەگوێـرەی ژیـار و پێشـکەوتنی شارسـتانییەتی ئیسـلامی نەبـوو.

بـەڵام زەمینەیەکـی لەبـاری بـۆ بووژانـەوەی ئەورووپـا پێکهێنـاوە، کـە دواتـر لـە سـەردەمی نوێـدا پێشـڤەچوونی شارسـتانیانەی گـەورەی لێکەوتـەوە کـە کاریگـەری بـۆ سـەر هەمـوو دنیـا هەبـوو.

## بەندی یەکەم: ئایین و کۆمەڵگای ئەورووپی:

### ١- کلێسەی مەسیحی (کریستیان):

ئایینی مەسیحی وەکو ئایینی ئاسمانی لە فەلەستین دەرکەوتووە و پەیامبەر و موژدەبەر بەخشی ئایینەکە حەزرەتی (مەسیح) (سڵاوی خوای لێبێت) بۆ ڕێگرتن لە خراپەکاری و ستەم و بێ دینی و بڵاوکردنەوەی یەکتا پەرستی و تەبایی و خۆشەویستی لەنێو مرۆڤدا هەوڵ و کۆششی بەردەوامی کردووە. مەسیحەت بەخێرایی لەنێو هەرێم و ئاوەدانییەکانی قەڵەمڕەوی دەوڵەتی ڕۆمانی دا پەرەی سەند و بڵاوبۆوە خەڵکێکی زۆر باوەڕیان پێهێنا، پاش سێ سەدە لە دەرکەوتنی، ئیمپڕاتۆریەتی ڕۆمانی وەکو ئایینێك دانی پێدانا. ئیتر ئەو چەوساندنەوەو ئازار و مەینەتیانەی بڕوادارانی مەسیحی لەسەر دەستی دەسەڵاتدارانی ڕۆمانی گیرۆدەی بوو بوون کۆتایی هات. لەساڵی ٤٣٨ زایینی ئاینی مەسیحی وەکو تاکە ئایینی ڕەوا لە ئیمپڕاتۆریەتی ڕۆمانی ڕێی پێدراو بتپەرستی قەدەغەکراو، بەمەش ئایینی مەسیحی بوو بە پێکهێنەر و ئاراستەکەری سەرەکی شارستانی ئەورووپای ئەو سەردەمە. کڵێسە لە ئایینی مەسیحی دا شوێنی خوداپەرستی و پاك بوونەوەیە لە تاوان، لە سەرەتای بڵاوبوونەوەی ئاینەکە و لەگەڵ زۆربوونی بڕواهێنەران کڵێسەکانیش زۆربوون کە بەڕێوەبردنی کاروباریان لە سەرەتادا سادە و بێ گرێ و گۆڵ بوو.

بەڵام پاش ئەوەی ئاینەکە لەزۆر جێگەی بڵاوبۆوە و کەوتە ژێر کاریگەری بیروباوەڕ و سروتە خۆجێیەکانی ئاینەکانی دیکە بەرە بەرە ئاڵۆزی لە ڕێکخستنەکانی کڵێسە دروست بوو . وای لێهات هەر کڵێسەیەك سەرۆکێکی هەبوو کە پێیان دەگوت (ئەسقوف) و ژمارەیەك قەشە هاوکاریان دەکرد.

### ٢- دەرکەوتنی پاپایەتی :

لە سەردەمی ئیمپڕاتۆریەتی ڕۆمانی لەنێو کڵێسەکانی مەسیحی دا، کڵێسەی ڕۆما خودان پێگەیەکی تاقانە و تایبەت بوو، ئەویش لەبەرئەوەی لە پایتەختی ئیمراتۆریەت بوو، هەروەها شیاوی و باڵادەستیەکەشی لە هەندێك دەقی دینی و کەلتووری مەسیحی دا سەلمێندرابوو.

کڵێسەی ڕۆما وەکو کڵێسەی دایك تەماشا دەکرا بەو پێودانگەی (بطرس) یەك لە یاوەرانی مەسیح ماوەیەك سەرۆکی کڵێسەی رۆما بوو و پیرۆزی و بەرەکەتی وی دوای خۆی بەجێنشینەکانی لەوێندەرێ براوە.
لەساڵی ٤٥١ زایینی وە نازناوی پاپا یان (خزمەتکاری خزمەتکارانی خوا) بە ئەسقوفی رۆما گوتراوە و دابەشبوونی دەسەڵاتی ئیمڕاتۆریەتی ڕۆمانی و لاوازبوونی وایکرد دەسەڵاتی پاپاکانی ڕۆما پەرەبسێنێ و هەرچی کاروباری ئایینی کلێسەکانی مەسیحی ڕۆژئاوا هەبوو لەلایەن پاپاوە سەرۆکایەتی و رابەری دەکرا یەکەمین پاپاش (لیۆ) ی یەکەم بوو.
لە بەناوبانگترین پاپاکانی ئەو سەردەمە (کلمنتی یەکەم، سیلڤستەری یەکەم، گریگۆری گەورە (٥٩٠-٦٤٠) زایینی.

### ٣- ڕەبەنی

ڕەبەنی وەکو دیاردەیەکی ئاینی مەسیحیەت هەر لە سەدەی سێیەمی زایینییەوە دەرکەوتووە، هەرچەندە ژیانی خوداپەرستی بە تەنها و لە چۆڵەوانی داو گردەنیشین کردن و خۆتەراندن لە ئاوەدانی بۆ پاککردنەوەی رۆح، ریشەیەکی رۆژهەڵاتی هەیە و لە شارستانییەتە کەونەراکانی هیند و چیندا، پەیڕەوکەرانی هەبوون، بەڵام لە ئایینی مەسیحی دا بەتایبەتی لە سەرەتای سەدەکانی ناوەڕاست دا پەرەی گرت و بوو بە بەشێك لە ژیانی ئایینی بەگشتی دەشێت ئاماژە بەوە بکەین کە بڕوای پتەوی ئاینی و خۆ قوتارکردن لە چەوساندنەوە و قەرەبوو کردنەوەی شکستی هێنان لە ژیان گرنگترین هۆکارەکانی سەرهەڵدانی ڕەبەنایەتی بوو.
لەبەدیارترین ڕەبەنەکانی سەدەکانی ناوەڕاست بڕوادارێکی میسری کە نێوی (باخۆمیۆس ٢٨٦ – ٣٤٦ زایینی)ە کە بە ڕێکخەری ژیانی ڕەبەنایەتی دادەنرێت، چونکە بەخۆیی و کۆمەڵێك لە برادەرەکانی بڕیاریان دابوو پێکەوە بژین و واز لە تەنەخی (گۆشەگیری) و تەمبەڵی بێنن و ئیش بکەن و دوور لە ئاوەدانی لە دێرێکدا پێکەوە خواپەرستی بکەن و خودان پێڕەو ڕێسای خۆیان بن .
بەم جۆرە ژیانی دێری بوو بە ڕوکاری دیاری ڕەبەنایەتی.
جگە لە باخۆمیۆس هەریەکە لە قەدیس بازل و قەدیسی بەندکت و لەنێو ناوە دیارەکانی ژیانی ڕەبەنایەتین.

## ٤- بیریارانی ئاینی مەسیحی

پـاش ئـەوەی ئایینـی مەسـیحی لـە دەوڵەتـی ڕۆمانـی دا بڵاوبـۆوە و بـڕوا پێهێنەرانـی زۆربـوون . لـە نێوانیانـدا چەنـدان کەسایەتی ئایینـی دەرکەوتـن کـە ڕۆڵـی گرنگیـان بینیـوە لـە پـەرەدان بەبیـری ئایینـی مەسـیحی و هەوڵیـان داوە شـیکردنەوەی خۆیـان هەبـێ بـۆ ژیـان .

قەدیسـی ئۆگسـتینی (٣٥٤ – ٤٣٠ زایینـی ) لـە دیارتریـن بیریارانـی مەسـیحییە کە لـە سـەرەتاکانی سـەدەکانی ناوەڕاسـتی بیـرو بۆچوونەکانـی خـۆی لەمـەڕ ئایـن و ڕابـردووی ژیـان دەربڕیـوە، بەناوبانگتریـن کتێبەکانی دانپێدانـان (Confessions) و شـاری خـوا (The city of God)، کـە لـە کتێبـی دووەم دا باسـی ئـەوە دەکات کـە مـرۆڤ لەژیانـی دا هاووڵاتـی دوو شـارە یەکەمیـان شـاری زەوی و ئـەوی تریـان شـاری ئاسـمان (خـوا) کـە شـاری یەکـەم نموونـەی خراپـەکاری و دەسـەڵاتی مەسـیحە. هـەر بـەو پێودانگـە ئۆکسـتینی لێکدانـەوە بـۆ لاوازی و ڕووخانـی دەوڵەتـی ڕۆمانـی دەکات.

پاپـا گریگـۆری یەکـەم ٥٩٠-٦٠٤ کـە بـە پیاوێکـی خێرەمەنـد و ڕۆشـنبیری سـەردەمی خـۆی دادەنـرێ لـە ژیانیـدا زۆرتـرە وەکـو پاپایەکـی بـەکار و بـە مشـوور بـۆ ئایینـی مەسـیحی ناسـراوە، بـەڵام چەنـدان کتێبیشـی نوسـیوە لەوانـە کتێبـی (گفتوگـۆکان) کـە باسـی ژیانـی ئایینـی دەکات.



ئاینی مەسیحی لە ئەوروپا لە سەدەکانی ناوەڕاست

## بەندی دووەم: زانست و ڕۆشنبیری

لە سەرەتای سەدەکانی ناوەڕاستدا، ئایینی مەسیحی بەجۆرێك لە ئەوروپا بڵاوبووبۆوە. کە بەرەبەرە کۆتایی بە بتپەرستی دەهێنا، بۆیە لەو وەختەوە قۆناغێکی هزری نوێ لە مێژووی ئەوروپا دەست پێدەکات. کە ئەدەبی مەسیحی جێی ئەدەبی کلاسیکی (یۆنانی و ڕۆمانی) دەگرێتەوە، بۆ ماوەیەك زانستی و هزر و فێربوون پووکانەوە و پەڕاوێز بوونیان بەخۆوە دیت و هەرچی لەو بوارەشدا هەبوو دەبوو لە خزمەت کڵێسە دابێ.

لە سەدەی هەشتەم و سەرەتای سەدەی نۆیەمی زایینی دا لە ئەوروپا هەندێك مەڵبەندی ڕۆشنبیری دەرکەوتوون و دیارترن هەوڵ و هەنگاوی لێبڕاوانە لەو بوارەدا خۆی لە ڕابوونێکی ڕۆشنبیری دادەبینیتەوە کە بە (بوژانەوەی کارۆلەنجی) بەناوبانگە، بەنێو دەوڵەتی کارۆلەنجی کە لە بەشێکی بەرچاوی ئەوروپای ڕۆژئاوا دەسەڵاتدار بوو، لە سەردەمی شارلماندا (٧٦٨-٨١٤ زایینی) گرنگی زۆر بە زانست دراوە شارلمان بۆخۆی هانی زانایانی داوەو دەستگیرۆیی کردوون . بوژاندنەوەی کارۆلەنجی هەرچەندە درێژخایەن نەبوو، بەڵام یەکەمین هەوڵ بوو بۆ تواندنەوە و گونجاندنی توخمی ڕۆشنبیریانەی جیاجیای کلاسیکی و جەرمانی و مەسیحی لەیەك بۆتە و کایەدا.

### ١- مەڵبەندەکانی ڕۆشنبیری:

لە سەرەتای سەدەکانی ناوەڕاستدا، لە ئەوروپا ڕۆشنبیری برەوێکی وای نەبوو، بەڵام لەسەدەی نۆیەمی زاینییەوە هەنگاوی هەڵێنا، هەندێك شاری ئەوروپا بزاوتێکی فێربوون و زانینیان تێ گەڕاو، زانا و هەڵوەدایانی زانستیان لێ خڕبوونەوە، شاری سالرنول لە ئیتالیاو

شارەکانی فولدا لە ئەڵمانیا و پاریس و شارتز لە فەڕەنسا لە دیارترین مەڵبەندەکانی ڕۆشنبیری ئەوروپا بوون. کە لەوێ و لەشوێنی جیاجیای دیکەی ئەورووپادا لە کڵێسەکاندا بەرەبەرە قوتابخانە دەکرانەوە و قوتابیان تێدا فێری خوێندەواری و زانین دەکران.



مەڵبەندێکی ڕۆشەنبیری لە ئەوڕوپا لە سەدەکانی ناوەڕاست

## ٢- فەلسەفەی قوتابخانەیی (سکولاستیك).

فەلسەفەی قوتابخانەیی فەلسەفەی مەسیحی سەدەکانی ناوەڕاستی ئەورووپایە، پێی دەگوترا قوتابخانەیی، چونکە لە قوتابخانەکانی ئەوکاتەی ئەورووپا دەخوێندرا.

قەدیس ئەنسلم ئوف کنتربری کە لە ساڵی ١١٠٩ زایینی کۆچی دوایی کردووە، بە دامەزرێنەر و بناغەی داڕێژەری فەلسەفەی قوتابخانەیی

دادەنرێ، ئەو کە پیاوێکی ئایینی مەسیحی بوو فەیلەسوفێکی هەڵکەوتووی سەردەمەکەی خۆی بوو، هەوڵی دەدا بوونی خواو ڕازەکانی ئاینی مەسیحی بە بەڵگەی لۆجیکی عەقلانیانە بسەلمێنێ.
فەیلەسوفانی ئەو سەردەمەی ئەوروپا لە هەوڵی گونجاندنی فەلسەفەدا بوون لەگەڵ ئاینی مەسیحی و دەیانویست لەگەڵ یەکیان بسازێنن، لەو پێناوەدا هەر لە سەرەتای سەدەی سێزدەهەمی زایینی لە ئەوروپا بەرەبەرە نووسراوە فەلسەفییەکانی ئەرستۆ وەرگێڕدرانە سەر زمانی لاتینی و دواتر کتێبە فەلسەفیەکانی فەیلەسوفی ئیسلامی ئیبن روشد وەرگێڕدرا بۆ زمانی لاتینی و وێڕای کتێبەکانی ئەرستۆ پێگەیەکی بەرچاویان لە زانکۆکانی ئەوروپا پێ برا.
تۆما ئەکوینی (١٢٢٥-١٢٧٤) زایینی یەك لە فەیلەسوفە بەناوبانگەکانی ئەوکاتەی ئەوروپا بوو. کەوا لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا کە بەناونیشانی (پوختەی لاهوت)، ڕاڤەیەکی قوڵی بۆ بیروباوەڕی کڵێسەی کاسۆلیکی کردووە، و هەوڵی داوە بیرو بۆچوونەکانی ئەرستۆ لەگەڵ ڕێنماییەکانی بگونجێنێ.
فەلسەفەی قوتابخانەیی هەر لەماوەی سەدەکانی ناوەڕاستی دا بەردەوام بوو، لە سەدەی چواردەی زایینی یەوە ئیتر بەرەو پوکانەوە چوو.

## ٣- هونەری بیناسازی:

لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، کاری بیناسازی بایەخ و گەشەکردنی بەخۆوە بینیوە و بە هونەرێکی ئەندازەیی جوان خۆی نواندوە. ئەمەش بەتایبەتی لە تەلار و بینا بنیادنراوە ئایینیەکاندا دەردەکەوێ، بەتایبەتی کاتدرائیەکان کە لە سەرانسەری ئەوروپادا دروست کرابوون.
شێوازێکی گرنگی بیناسازی ئەو سەردەمەی ئەوروپا (ئەندازیاری ڕۆمانسیە) کە زیاتر بۆ دروستکردنی کڵێسەکان بەکاردەهات کەوا بنمیچی لە کەرپووچ دروست کراو دیواری ئەستوور بوو هەیوانێکی سەرەکی هەبوو. کە لە هەردوو لاوە دوو ڕاڕەوەی تەسکی پێدادەهات کە دینگە و پایەی

گەورەیـان لەنێوانـدا هەبـوو، بۆئـەوەی بنمیچەکـە ڕابگرێـت. و کەوانەیـەك سـەری دینگەکانـی بەیـەك دەگەیانـد و لـە کڵێسـای ڕۆمانسـکیدا پەنجـەرەی گچکـە هەبـوو ئەمـەش بـۆ پاراسـتنی قایمـی دیـوارەکان.

جۆرێکـی دیکـەی ئەندازیـاری بیناسـازی بریتـی بـوو لـە هونـەری بیناسـازی (قوتـی) کـە بەنێـوی قوتـەکان کرابـوو ( یەکێکـن لـە میللەتانـی کۆنـی ئەوروپا) ئەمـەش بریتـی بـوو لـە تـەلاری مـەزن و بڵنـد و هـۆڵ و پەنجـەرەی گـەورە لەخۆدەگـرێ، و لـەو جـۆرە بیناسـازیەو فراوانـەدا دیـواری قـەد ئەسـتوور نییـە، بەڵکـو زیاتـر دینگـە بەکاردێنـیٚ لەگـەڵ کەوانـەی بنمیچـی و شوشـەی تاریـك بـۆ پەنجـەرەکان، و ئـەو دیوارانـەی کـە تێیـدان بـە وێنـە و نووسـراوی جیـا جیـا دەڕازێنرێنـەوە و کۆشـکەکەش بڵنـد و بـاڵا دەکـرا، دیـارە ئەمـەش هـۆکاری ئایینـی لەپشـت بـوو بـۆ ئـەوەی دەروونـی مـرۆڤ هەسـت بـە مەزنـی و هەڵکشـان و هەیبـەت بـکات.

## ٤- دەرکەوتنی زانکۆکان:

وشـــەی زانکـــۆ (University) لـــە ســـەرەتادا، لـــە ســـەدەکانی ناوەڕاســـتدا، بەشـێوەیەکی گشـتی و بەرفراوانـی بەکاردەهـات، هـەر بـۆ گردبوونـەوەی مامۆسـتایان و مەڵبەندەکانـی زانسـت بـەکار نەدەهـات، بەڵکـو بـۆ ڕێکخـراو و سـەندیکای جۆراوجـۆری بازرگانـی و پیشـەیش بەکاردەهـات، خڕبوونـەوەی مامۆسـتاو قوتابیـان لـە دەوری یەکـدی کۆمەڵێـك یـان سـەندیکایەکی لـیٚ پێـك دەهـات، بـە تێپەڕینـی کات نـاوی زانکـۆ هـەر بـەو جـۆرە ڕێکخراوبوونـە دەگوتـرا کـە پێڕەوێکـی فێربوونـی نوێـی هەبـوو.

کۆبوونـەوەی زانکۆییانـەی بـەدوو شـێوە پێـك دەهـات، یـان مامۆسـتایەکی بەناوبانـگ قوتابـی لەکـن کۆدەبوونـەوە یـان قوتابیـان بۆخۆیـان کۆمـەڵ دەبـوون و مامۆسـتایەکیان بەکـریٚ دەگـرت.

بەرەبـەرە زانکـۆ ئیـدی چوارچێوەیەکـی زانسـتی لەخـۆوە دەگـرت و دەبووبـە دامەزراوەیەکـی دیـاری کۆمەڵـگا کـە پێویسـت بـوو قوتابـی لـە میللەتانـی جۆراوجـۆر لەخـۆوە بگـریٚ و دەبـوو لقێـك لـە لقەکانـی مەعریفـەی لـیٚ

بخوێنرێ و دەستەیەك لە مامۆستایانی پسپۆڕ وانەی تێدا بڵێنەوە.
بەم جۆرە زانکۆ بەناوبانگەکانی ئەوروپا لەکۆتاییەکانی سەدەکانی ناوەڕاست دەرکەوتن، وەکو زانکۆی پاریس ساڵی ١٢٠٠ زایینی دواتر زانکۆی ئۆکسفۆرد و کمبرج ....هیتر . لە زانکۆکانی ئەوکاتەدا لایەنی زمان و ئەدەب و زانستەکان دەخوێندران، دەبوو قوتابی بە سەلیقە و زەین ڕوون و گوێگری چاك بێ و زانیاری لەبیر بمێنێ و خاوەن ڕامان و ئەندێشە بێ و ڕێز لە مامۆستایانی دەزگا زانستیەکان بگرێ و ئیدی خولیای بکەوێتە سەر خوێندنەوە و فێربوون و بە پیرۆزیان بزانێ، کاری زانستیانەیە و سووربوونی بەردەوامی نەوە لەدوای نەوە، میللەتانی ئەوروپا و فراوانی و بالآبوونی ژیانی زانکۆیی بوو، ئەوروپای گەیاندە ئەورۆ و ئاوا پێشی خست.



مەڵبەندێکی ڕۆشەنبیری لە ئەوڕوپادا

# بەشی دووەم:



## شارستانییەتی ئەوروپا لە سەردەمی ڕێنیسانسی دا

### یەکەم: سەردەمی ڕێنیسانس:

ڕێنیسانس(**Renaissance**)کە بە واتای بوژاندنەوە یان زیندووکردنەوە

دێت، لەمێژووی ئەوروپادا بەو سەردەمە دەگوترێت کە کۆتایی سەدەکانی ناوەڕاست و سەرەتای سەردەمی نوێ دەگرێتەوە، کە هەر لە سەدەی چواردەهەمەوە تا سەدەی حەڤدەیەمی زایینی دەخایەنێ، بۆیە بە سەردەمی بوژانەوە ناودێرکراوە، چونکە ئەوروپا لەو وەختەدا وەخۆهاتنەوەیەکی بەرچاوی بەخۆیەوە بینی و سەرهەڵدان و گەشەکردنی نوێی لەبواری بیر و داهێنان دا تێدا هاتە کایەوە.
دەشێ بەشێوەیەکی گشتی بڵێن بوژاندنەوەی ئەوروپا ئەوکاتە سەرجەم بوارە جۆراوجۆرەکانی ژیانی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و هزری گرتەوە و وای کرد سەردەمی ڕێنساسی کۆتایی سەردەمێك و دەستپێکی سەردەمێکی دیکە بێ.

## دووەم: تایبەتمەندییەکانی سەردەمی ڕێنیسانس:

١- سەرەتایەکانی دەست پێکردنی و پێشڕەویکردنی بوژانەوەی ئەوروپی لە شارەکانی ئیتاڵیاوە سەرچاوەی گرت و بە ئەورووپادا بڵاوبووەوە دواتر کاریگەری بەسەر هەموو دنیاوە بەجێهێشت.

٢- ڕێنیسانس وەکو بزاوتێکی هەمەلایەنە زادە و بەرەنجامی ژیانی شارنشینی و پێویستییەکانی بەرەوپێشچوونی بواری کۆمەڵایەتی و ئابووری و خەڵك بوو.

٣- ڕێنساس پێگەی عەقڵی لە ژیان دا بەرز نرخاند و خستییە ئەو خانەیەی کە شایانیەتی و وەگەڕخستن و ئاراستەکردن عەقڵیش ئەوکاتە پێویستی بە دوورکەوتنەوە لە خەیاڵ و ئەفسانە و شتی ناڕاست هەبوو.

٤- گرنگیدان بە سروشت و تێڕامان لە جوانی و سروشتی کە دواتر ڕێی خۆشکرد بۆ هەستکردن بە خود و هەوڵدان بۆ بەرجەستەکردنی خودگەرایی لە خوێندنەوەی دەوروبەردا.

٥- دەرکەوتنی بزاوتی مرۆڤگەرایی(Humanism) کە گوزارشتێکی ڕوون لە سەردەمی ڕێنساس دەکات، مرۆیی واتە ئەو کەسەی کە گرنگی بە ڕۆشنبیری دەدا و تێی دەگات، ئەویش وەکو بەرەنجامێك بۆ گرنگیدان بە عەقڵ و نەخشی لە تێگەیشتنی لە ڕەوشی گەشەکردنی مرۆڤایەتی دا، تایبەتی ڕۆشنبیری سەردەمی کلاسیکی (یۆنانی و ڕۆمانی) کە بوارە جیاجیاکانی زمان و ئەدەب و فەلسەفە و مێژووی یۆنانی و ڕۆمانی دەگرێتەوە . هەر لەو وەختەوە ئەو پانتاییانەی مەعریفە بە مرۆیی ناسراون.

## سێیەم: هونەری سەردەمی ڕێنیسانس:

هونەر وەکو ڕەنگدانەوەی ئاوێنەی باڵانمای ژیان لەکۆنەوە لەلای مرۆڤ بایەخی هەبووە و لەڕێیەوە پەیامی قۆناغە جیاجیاکان هەڵکشاوە، یەك لە دیارترین لایەنە پێشکەوتووەکانی بوژانەوەی ئەورووپی هونەری سەردەمی ڕێنسانسە چ پەیکەرتاش یان نیگارکێشی یان بیناسازی بێت.

لە دیارترین هونەرمەندانی ڕێنیسانس لە ئیتاڵیا شێوەکار جیوتو (١٢٧٦-١٣٣٧ ز ) بوو کە هونەرمەندێکی بەناوبانگی سەردەمەی خۆی بوو . کە شێوازێکی لە وێنەکێشان دا بەکاردەهێنا پشتی دەبەست بە ڕەنگە زەیتیەکان و لەسەر دیوار بە گەچی خاو دەیڕازاندەوە و گەر وێنەکە تیشکی ڕۆژ و با و باران لێی نەدابا بۆ ماوەیەکی زۆر لەسەر دیوارەکە دەمایەوە، زیاتر دیواری ناوەوەی کڵێساکان بەو وێنانە دەنەخشێنراو هەندێکیان دوای سەدان ساڵ هەر جوانی و ڕەونەقی خۆیان لەدەست نەدا.

لیۆناردۆ داڤنشی (١٤٥٢-١٥١٩ ز) بەیەك لە مەزنترین داهێنەرانی سەردەمی ئێستای دادەنرێ، ئەو وێنەکێش و ئەندازیاری بیناساز و میکانیك زانای سروشت هەڵکەوتوویەکی ئیتاڵیا بوو.

داڤنشی لە هونەرەکەیدا دەیویست لە ڕازی سروشت تێبگا و بەرجەستەی بکا و بیخەملێنێ، لێهاتوانە پەنهانی جوانی پەی پێبەرێ و لەسەر تابلۆیەکانی بینەخشێنێ، هەتا سەردەمی داڤنشی، وێنەکێشان زیاتر لەسەر دیواران دەکرا و مۆرکی ئایینیانەی بەسەردا زاڵ بوو، بەڵام بەرەبەرە خۆ رزگارکردن لەو کۆتانە بوو بە سیمایەکی هونەری ڕێنسانس و تابلۆی چوارچێوەدار کە بشێ هەڵبگیرێ و بگوازرێتەوە ئیدی باوبوو لەلای داڤنشی زۆرتر بەکاردەهات و هەریەکە لە تابلۆکانی جۆرێك چێژ و قەشەنگی تێدابوو.

لەکارە هونەرییە نەمرەکانی داڤنشی دەکرێ ئاماژە بە تابلۆی (مۆنالیزا یان جۆکەندە) بکەین کە زۆربەمان پێی ئاشناین، ئێستاش لە مۆزەخانەی (لۆڤەر) لە فەرەنسا پارێزراوە، کە گوزارشتێکی وەستایانە و دەست ڕەنگینانەی لە

زەردەخەنەی ئافرەتێك كردوە كە ئاویزانی نیگایەكی تەماویە.
جگە لە داڤنشی داهێنانی دیكەی لە بوارە جیاجیاكاندا زۆرن و ئەمەش وای كردووە ئەو بەناوبانگترین كەسایەتی سەردەمی ڕێنسانس بێ.
میكائیل ئەنجیلۆ (١٤٧٥-١٥٦٤ ز) هونەرمەندێكی پەیكەرتاش و نیگاركێش سەردەمی ڕێنساسە، پەروەردەو كەسایەتیەكەی لە هی داڤنشی جیابوو، زیاتر بە پەیكەرتاش و كۆتەڵكار نێوبانگی دەركردبوو، زۆرتر بابەتە هونەرییەكانی خۆی لە تەورات وەردەگرت و وێنە و پەیكەری پێغەمبەرانی جولەكە و كەسایەتییە ئەفسانەییەكانی مێژووی كۆنی دروست دەكرد. لە هونەری میكائیل ئەنجیلۆد گرنگییەكی بەرچاو بەژن و لەش و لاری مرۆڤ داوەو زۆرجار بەڕووتی لە تابلۆ كۆنەكانی خۆیدا بەرجەستەی كردووە.
پەیكەری (داود) یەك لە دیارترین كارە هونەرییەكانی ئەنجیلۆیە كە لەبەردی مەرمەڕ دروست كراوەو سێ ساڵان كاری لەسەر كردووە، هەروەها دروستكردنی كڵێسای قەدیسی (بگرس) لە ڤاتیكان دروستی كردون كە سەرگوزشتە و دیمەنەكانی بونیادنانی دنیا و لافاوی سەردەمی نوح و ڕۆژی دوایی (قیامەت) لەخۆ دەگرێ نموونەی دیاری كارەكانی ئەنجیلۆن .

## چوارەم: ئەدەبی سەردەمی ڕێنسانس:

لە سەردەمی ڕێنساس دا بوارە جیاجیاكانی ئەدەبی گەشانەوەیان بەخۆوە دیت و زۆر بەرهەمی ناوازە لەو وەختەدا نووسراون ئێستاش لە ئەدەبی جیهانیدا جێگای شایستە و تایبەتیان هەیە، زۆر لە مێژوونوسان پێیان وایە دەسپێكی ڕێنسانس لەبەر هەمە ئەدەبیەكاندا خۆی نواندووە.
دانتێ (١٢٦٥-١٣٢١ز) یەك لە گەورە ئەدیبەكانی ئیتاڵیای سەردەمی ڕێنسانس بوو، هەرچەندە زمانی سەردەم لاتینی بوو، بەڵام دانتێ زمانی نەتەوەیی بەرز دەنرخاند پێی وابوو زمانی نەتەوەیی لەباری دا هەیە لە پێشكەوتنی ڕرشنبیری كۆمەڵگادا ڕۆڵێكی بەرچاو بگێڕێ، هەر بۆیە

بانگەشـەی لاکردنـەوەی لـە زمانـە نەتەوەییەکانـی ئەورووپـا کـردووە، وای دەبینـی چونکـە زمانـی خەڵکـی ڕەمەکییـە لـە هـەر وڵاتێکـدا دەشـێ نووسـین بـەو زمانانـە هەرمێنـی هەبـێ و خوێنـەری زیاتـری لـە دەور کۆببێتـەوە.
شـاکاری بەنێوبانگـی دانتـێ کتێبـی (کۆمیدیـای یەزدانییـە ) کـەوا تیایـدا خەیاڵـی شـاعیرانەی ئاوێندانـی بیروبـاوەڕی ئایینـی کـردووە و، وێنەیەکـی هێـژای بەهەشـتی و دۆزەخـی کـردوە، و مێژوونووسـان پێیـان وایـە دانتـێ، لـەو بەرهەمـە ئەدەبییـەدا کەوتۆتـە ژێـر کاریگـەری هەندێـك لـە هزرمەندانـی ئیسـلامی سـەردەمی خەلافەتـی عەباسـی .
ئەدیبێکـی دیکـەی ئـەو سـەردەمە بـە تـراك (١٣٠٤-١٣٧٤) بوو، کـە هەرچەندە کاریگـەری دانتـێ بەسـەرەوە بـوو، بـەڵام لاسـایی کـەرەوەی نەبـوو، ئـەو بەقـەد دانتـێ هۆگـری پێشـینان نەبـوو، پێـی وابـوو پێویسـتە ڕۆشـنبیر زیاتـر گرنگـی بـە سـەردەمەکەی خـۆی بـدا و تێـی بـگات، بۆیـە لـە نووسـینەکانی بەتـراك هەسـتێکی خەمئامێـز و دڵەڕاوکێیەکـی دەروونـی هەسـت پـێ دەکـرێ، دەشـێ وەك نووسـەرێکی بەهەسـت، گیـرۆدەی نامۆبـوون بووبـێ.
بـە تـراك لەگـەڵ ئـەوەش دا ڕێـزی لـە زاناکانـی پێـش خـۆی نـاوە و لـەو بـوارەدا کتێبێکـی نووسـیوە بەنێـوی (چەنـد نامەیـەك بـۆ نووسـەرانی کـۆن) و ئـەو لـە بـواری پـەروەردە و فێرکردنـدا حـەزی لـە سـادەیی و بێگـرێ و گۆڵـی ئـەو بابەتانـە بـووە، کـە پێویسـتە قوتابیـان بیخوێنـن.
پۆکاشـیۆ (١٣١٣-١٣٧٥) لـەو ئەدیبانەیـە کـە زۆر بەتەنـگ زیندووکردنـەوە و تەکاندنـی کولتـووری کلاسـیکی بـوو، بەزمانـی میللـی ئیتاڵیـا دەینووسـی و لـە دیارتریـن بەرهەمەکانـی کتێبـی (دیکامیـرۆن) ە کـە نیشـانەی گرنگیدانیەتـی بـە مێژووی ئیتاڵیـای سـەدەی چـواردە و پـازدەی زایینـییە.

## پێنجەم: چاپ و بڵاوکردنەوەی کتێب:

لە سەردەمە کۆنەکاندا مرۆڤ نووسینی لەسەر قوڕ یان بەرد و تەختە ئەنجام دەدا، بەڵام لە ناوەڕاستی سەدەی سێزدەوە کاغەز لە ئەورووپا بڵاوبۆوە، لە سەدەی پازدەیەمەوە پیتی چاپکردنی جوڵاو (المتحرك) ی کانزای داهێنرا، ئەم داهێنانە زانا و ڕۆشنبیری زۆر ڕۆڵیان تێدا گێڕاوە، بەڵام مێژوو نێوی زانای ئەڵمانی گۆتنبرگی بە نەمری هێشتۆتەوە، کە لە دەوروبەری ساڵی ١٤٥٥ ز کاری چاپکردنی ئینجیلی ئەنجام داوە.
لەدوای ئەڵمانیا چاپخانە لە ئیتاڵیا و شارە جیاجیاکانی ئەورووپا کراونەوە و کاریگەری زۆر گەورەی بەسەر ژیانی ڕۆشنبیری بەجێ هێشتووە.



چاپکردن لە سەردەمی ڕێنساس

**گرنگترین بەرەنجامەکانی کاری چاپکردن و بڵاوبوونەوەی چاپخانە:**

١- زۆربوونی ژمارەی کتێب و هەرزان بوونی و ئاسان دەستکەوتنی .
٢- بەهۆی چاپکردنەوە کتێب ڕوونتر بێ هەڵەتر لەجاران بڵاو دەبۆوە.
٣- گەشەکردنی بەرچاوی ژیانی زانستی و مەعریفی خەڵك، بەهۆی ئاسان دەستکەوتنی کتێب و زۆربوونی خوێنەر بە شێوەیەك کە ڕۆشنبیری بە میللی بوو، وەکو جاران سنوردار و تەرخان نەبوو تەنها بۆ چەند ڕۆشنبیرێك.
٤- هەرمێن پەیداکردنی بازاڕی کاغەزو چاپکەر و بەرگ تێکران و ڕەنگدانەوەی بەسەر بازرگانی ئەو سەردەمەدا.
٥- زیادبوونی پەیوەندی ڕۆشنبیری لەنێوان هەرێمە جیاجیاکان و دەرکەوتنی کتێبخانەکان بەشێوەیەکی بەرفراوان و بوونیان بە مەڵبەندی تیشکدەری ڕووناکبیری.



کتێبخانەیەك کە کتێبی ئەوسەردەمەی لێ هەڵگیراوە

## شەشەم:دۆزینەوە جوگرافییەکان

یەك لە گرنگترین سیما پێشکەوتنەکانی ئەورووپا لە سەردەمی رێنسانسدا ئەو چالاکییە دەریاوانیانە بوو کە ئەورووپاییەکان بۆ دۆزینەوە و ئاشنا بوون بە دونیای دەرەوەی خۆیان بەتایبەتی شوێنە دوورە دەستەکان ئەنجامیاندا. کە لە مێژوودا بە دۆزینەوە جوگرافییەکانی (الاستکشافات الجغرافیە) ناسراوی.



کەشتیگەلێکی سەردەمی رێنسانس

## أ- گرنگترین هۆکارەکانی دۆزینەوەی جوگرافییەکان:

١- حەزی ئەوروپییەکان بۆ دۆزینەوەی ڕێگای بازرگانی نوێ کە بیان گەیەنێتە هیندستان و ڕۆژهەڵاتی دوور، ڕێگایەك کە بە ناوچەکانی ژێر قەڵەمڕەوی عوسمانیەکاندا نەڕوا، چونکە لەگەڵ ئەوروپییەکان بەردەوام ناکۆکییەکان هەبوو.

٢- هەندێك جار ئەو دۆزینەوە جوگرافیانە هۆکاری ئایینی لەپشتەوە بوو، کەوا لە کڵێسای کاسۆلیکی مەسیحی، دەیویست ئایینی مەسیحی لەو شوێنە دوورە دەستانە بڵاوبکاتەوە کە ئاینەکەیان پێ نەگەیشتووە.

٣- کەڵەکەبوونی زانیاری دەریاوانی و جیهانگەرانیی لەلای دەریاوانەکانی ئەوروپا وایکرد کە ئەوان دەیانویست ئەو زانیاریانەی لەسەر دەریا و کیشوەرەکان هەیانە بەکاری بخەن و حەزی خۆیان بۆ دۆزینەوە و پەیبردن بە پەنهانیەکانی دنیایی دەوروبەر تێر بکەن.

٤- خواست و ویستی ئەوروپییەکان بۆ دەستکەوتنی بەهارات لە ڕۆژهەڵات وێڕای کاڵای بازرگانی دیکە هۆکاری گرنگ بوو.

## ب- شەپۆلی دۆزینەوە جوگرافییەکان.

دەوڵەتـی پورتـوگال بەیـەك لـە هەوەڵێـن ئـەو دەوڵەتانـە دادەنرێ کـە گرنگی بـەکاری دۆزینـەوە جوگرافیـەکان داوە، وە لـەو بـوارەدا میـر (هنـری) دەریاوانـی پورتوگالـی ڕۆڵـی بەرچـاوی بینیـوە کـە وەکـو دەسـەڵاتدارێك هـەردەم پاڵپشـتی هەوڵەکانـی دۆزینـەوە جوگرافیـەکان بـووە، لەسـەردەمی ئـەودا کەنارەکانـی ئەفریقیـای ڕۆژئـاوا دۆزرانـەوە.

دواتـر دەریـاوان (ڤاسـکودی گامـا) بـەدەوری (رأس الرجـاء الصالـح) دا سـوڕایەوە لەسـاڵی ١٤٩٧ کـە لـە باشـووری ئەفریقیایـە.



فاسکۆدی گاما



میر هنری

حکومەتـی ئیسـپانیاش لـە دۆزینـەوە جوگرافیەکانـدا ڕۆڵـی بەرچـاوی بینـی.
لەسـەر هەموویانـەوە دەریـاوان (کریسـتۆڤەر کۆڵمبـس ١٤٤٦-١٥٠٦) کـە بـۆ خـۆی ئیتاڵـی بـوو پێـی وابـوو زەوی خـڕە و ئاسـمانیش لـە ڕۆژئـاوای ئەوروپایـە، کۆڵمبـس لەلایـەن دەریـای دەسـەڵاتدارانی ئیسـپانیا پشـتگیری کـراو لەسـاڵی ١٤٩٢ لەگـەڵ سـێ کەشـتی و هەشـتاو حـەوت کـەس دا بـەرەو ڕۆژئـاوا بەڕێکەوتـن، بەڵکـو لەوێـوە بگاتـە چیـن پـاش ٣٢ ڕۆژ گەیشـتە وشـکانی و کـە دوورگەکانـی (کەنـاری) بـوون و پێـی وابـوو دوورگەکانـی هینـدی ڕۆژهەڵاتـە و دوای ئـەوە هـەر بەهەمـان ئاراسـتە کۆڵۆمبـس سـێ گەشـتی دیکـەی کـرد گەیشـتە کەنارەکانـی هینـدۆراس و فەنزوێـلا، هەتـا مردیـش هـەورای دەزانـی گەیشـتۆتە دوورگەکانـی هینـدی ڕۆژهـەڵات و نەیزانـی جیهانـی نـوێ (ئەمەریـکا) ی دۆزیوەتـەوە.



کریستۆڤەرکۆڵمبس

# پێرست